

# دەوڵەتی هاونیشتیمانیبوون و بەشداری پێکردن و فرەیی

**لەتەرازووی شەریعەت و ڕووداوە مێژووییەکان و شارستانیتی ئیسلامیدا**

نووسینی: دکتۆر ئیبراهیم ئەمین جاف
وەرگێڕانی: ڕێدار ئەحمەد



**دەوڵەتی هاونیشتمانیبوون و بەشداری پێکردن و فرەیی**
**لە تەرازووی شەریعەت و ڕووداوە مێژوویەکان و شارستانێتی ئیسلامیدا**

.......................................................................

لە بڵاوکراوەکانی ناوەندی هزریی و ڕۆشنبیریی خاڵ (١٢)

**نووسینی:** دکتۆر ئیبراهیم ئەمین جاف
**وەرگێڕانی:** ڕێدار ئەحمەد
**دیزاین:** ڕەوشت محەمەد
**تیراژ:** ١٠٠٠ دانە
چاپخانە: هێڤی

لە بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی کتێبخانە گشتییەکان
ژمارە (     )ی ساڵی ٢٠١٧ی پێدراوە

## ناوەرۆك

# پێشەکی[1]

لەسایەی نەبوونی دەوڵەتی ئیسلامیدا بۆ نزیکەی سەدەیەک و، ڕوودانی گۆڕانکاریی ڕیشەیی لەسیستمی حوکمڕانی وڵاتانی موسڵمانداو، هاتنە کایەی سیستمی نویێ بۆ سەر دەسەڵات، وەک سیستمی: نیشتمانی، عەلمانی، سوسیالستی و، جگە لەوانەش، مشتومڕێکی نەزۆک لەنێو شوێنکەوتووانی ڕەوتە ئیسلامیە جۆراوجۆرەکان و، ڕەوتەکانی تردا سەبارەت بەچۆنیەتی حوکمڕانی و بەڕێوەبردنی وڵات ماوە دێتە ئاراوە، ئایا دەکرێت ڕەوتێکی نیشتمانی وڵات بەڕێوە ببات کەهەموو ڕەنگە جیاوازەکانی گەل تێیدا بەشداربن و وڵات سەقامگیر و ئاسایش بێت و، دەوڵەتی دەستوورو یاسا بونیات بنێت کەبەکردارییی مافی هاونیشتمانیبوون بەبێ جیاوازی لەسەر بنەمای ڕەگەز یان هەرێم یان ڕەنگ یان ... هتد، بۆ هەموان

---

**[1] ئەم لێکۆڵینەوەیە لەسەر خواست و داوای دەستەبژێرێک لەڕووناکبیران و مامۆستایانی زانکۆو نیشتمانپەروەران لەچەند ئاراستەیەکی جیاواز لەعێراق نووسراوە.**

دابین بکات، بەبێ زیانگەیاندن بەنەگۆڕە ئاینی و نەتەوەیی و جگە لەوان؟

ئایا بەڕاست ئیسلام ڕۆڵی هاونیشتمانیبوونی لەڕێنمایی و یاساکانیدا فەرامۆش کردووەو، تەقوای کردۆتە تەرازووی هاونیشتمانیبوون، واتە تەنها دەستی بەبەها ئیسلامییەکانەوە گرتووەو، بەمەش هیچ هاووڵاتیەکی تر کە لەو نیشتماندا بژی کەئیسلام حوکمڕانی دەکات هیچ بەهایەکی نیە، وەک ئەوەی هەندێک لەوانەی کەدژی شەریعەتی ئیسلامی دەیڵێن؟

لەسایەی حوکمڕانی سیستمە شمولیی و دیکتاتۆریەکانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا، مرۆڤ بەهاونیشتمانی باش دانانرێت تا ئینتیمای تەواوی نەبێت بۆ ئاین یان تائیفە یاخود نەتەوە یا حزب یان شتێکی دیاری کراو.

بەدرێژایی ماوەی حوکمڕانی رژێمی بەعس لەعێراق، پێکهاتەکانی تری عێراق (جگە لەعەرەب) ڕووبەڕووی وەلانان وپەراوێزخستن و کۆچپێکردن و لەناوبردنی بەکۆمەڵ و بێبەشبوون، سادەترین ماف لەمافەکانی هاونیشتمانیبوونیان بوونەتەوە، لەکاتیکدا کەهەزاران ساڵە باوو باپیریان لەسەر ئەم خاکە دەژی!.

سەبارەت بەسیستمی دیموکراسیی (تائیفی) فریودەری نوێی بەرکار لەماوەی پاش حوکمی بەعسەوە (٢٠٠٣) بەدواوە، ئەمەش کۆپیەکی دووبارەکراوەیە، یاخود هەمان دراوی کۆنە بەڵام بەڕووەکەی تری، بگرە لەچەندین بواردا لەویش خراپترە، تەنها لەڕووی بانگەشەو ڕووکەشەوە نەبێت، تەنانەت ڕووکەشیش لەئەمڕۆدا بەهۆی ئەو خوێنڕێژیی و تایفەگەرییە بێزارکەرو دژی

وتالاَنکـاری ولاَت و سـوکایەتی بەشـکۆی مـرۆڤ، بینیوویانـە ئـەو دروشمە نەماوە کەسانێکی زۆر کەم عەقڵیشی پێ فریو بدرێت!.

هـەروەها بینیمـان ئەزموونـە تاڵـەکانی دەوروبـەرمان هـەموویان دروشمی ئیسلامیان هەڵگرتووە، بەلاَم بەداخـەوە، خراپبوون بەرانبـەر ئیسلام و، بنچینەو بنەماو ڕێسا بێگەردەکانی، بەجۆرێک کەگەلانی ئەو وڵاتانە ئاواتەخوازن لەهەر شتێک ناوی ئیسـلامی بێت (نـەک ئیسـلام، چونکـە خەڵکەکـە موسـڵمانن) دەربازیـان ببێـت، ئەمـەش بـەهۆی ئـەو نەهامـەتی وبەلاَیانـەی لەسـایەی فـەرمانڕەوایی ئەوانـەدا بینیویانـەو بەسەر خۆیان و نیشتمانەکەیان هاتووە!.

لەهـەمان کاتـدا سیسـتمی نیشـتمانی خـاوەن بەرامـەی ئیسـلامی هەیە کە گەیشتونەتە فەرمانڕەوایی و، تا ڕادەیەک سـەرکەوتوو بـوون لە بەڕێوەبردنی وڵاتدا لەڕووی –گەرچی بەدەر نین لەتێبینی و ڕەخنە لەهەنـدێک لایـەنی- سیاسـی و ئـابووری و زانسـتیەوە وەک وڵاتـی تورکیـاو مالیزیـاو، وڵاتـی مـەغریب و، وڵاتـی تـونس و، جگـە لەوانـەش کەپابەنـــد بـــوون بەدەوڵـــەتی هاونیشـــتمانیبوون و دەســـتوورو هاوبەشێتیەوە، کـە ئـەزموونی دەوڵـەتی تورکیـاو حزبـی فـەرمانڕەوای هێشتا لەبواری ئەزموونکردندایە!.

بەخۆداچوونـەوەو دانیشـتن لەسـەر مێـزی گفتوگـۆو، کردنـەوەی دۆسـێیە بچـوک وگـەورەکان و پاشـان پێداچوونـەوەیان بەشـێوەیەکی ڕاستگۆیانەو دەستپاکی و واقیعیبوونـەوە، دوور لەوروژاندن، یـان بـۆ بەسـەربردنی کـات و، سـپاردنی بـە کەسـانی نـەفام ونەخوێنـدەوار و، خستنەرووی بەگوێرەی شـەریعەتی ئیسلامی لێبوردەو، مشتومرکردن لەسـەری، لەئەمڕۆدا بۆتە پێویستیەکی شـەرعی زۆرپێویست، ئەم کارە تایبـەت نیـە بـەحزب یـان کۆمەڵـە یان نیشـتمان یـان هۆزێکـەوە، بـەڵکو

پەیوەنـدداره بەهــەموو مرۆڤایەتیــەوه، چونکــه کەشــتی نیشــتمان و، هۆزو، مرۆڤایەتی ئەگەری نغرۆبوونی هەیه ئەگەر بەئاگا نەیەینەوه!.

ئەمـه توێژینەوەیـەکی سـاده یـان مەشـخەڵی ڕێیـه بـەتیرِوانینێکی شــەرعی بۆکـاری بەکۆمـەڵی نیشـتمانی هاوبـەش و، دەوڵـەتی یاسـاو هاونیشــتمانیبوون، هیواخــوازم دوور نــەبێت لەڕێســا بــەرزەکانی شەریعەت، بەڵکو بەپێی ئەو بێت و جێگای ڕەزامەندی بیت لای خوای گەورەو لای ئەهلی عیلم و ڕۆشنبیرانی ڕۆڵەی ئومەتەکەمان.

بەزمانیکی ئاسان نوسیووومه کە هـەمووان لێی تیبگـەن و، زۆرێک لــەدەقی زانایــان و مێژوونووســان و ڕۆژهەڵاتناســانم بەمەبەســتی ڕیشەدارترکردنی ئەوەی بۆی دەچم وەک شاهێد بەبەڵگه هێناوەتـەوه، سـەیر ئەوەیـه پـێش نزیکـەی سـی سـاڵ، ئـەو کاتـەی قوتـابی قۆنـاغی دکتۆرا بووم داوای لێکۆڵینەوەیەکی نزیک لەم بابەتەم لیکرا سـەبارەت بـه: گەشەسـەندنی نیشـتەجێبوون لەسـەدەکانی پـێش مێـژوودا، واتـه مرۆڤی سەرەتاو، چۆن بووەو، چۆن لەو وڵاتەدا مامەڵەی کردووه!.

**( دوبەی ٧ / ٢ / ٢٠١٧ز).**

## بەرایی: هاونیشتمانیبوون لەڕووی زمانەوانیو زاراوەوە

نیشـــتمان (الـــوطن) لـــەڕووی زمانەوانیـــەوە: شـــوێنی مرۆڤـــە و جێگەیـــەتی و نیشـــتەجێ بـــووە (أوطـــن) لـــە فلانـــە خاكـــدا وئـــاوەدانی كردۆتەوە و كردویەتیە شوێنی ژیان و نیشتەجێبوونی[1].

لـــەڕووی زاراوەوە: مانـــای هاونیشـــتمانیبوون بـــەپێی جیـــاوازی سیســـتم و دەوڵـــەت و چەمكـــە كۆمەڵایـــەتی و سیاســـیەكان جیـــاوازی هەیە، پێناسەیەكی گشتگیری تەواومەند بۆ چەمكی هاونیشتمانیبوون نیـــە، لـــەمیانی ئـــەو پێناســـەی زۆرانـــەوە دەتـــوانین بڵێـــین كـــە هاونیشـــتمانیبوون بریتییـــە لـــە: پەیوەســـتبوون بـــەخاكێكی دیـــاریكراو،

---

[1] اليحصبي السبتي: عياض بن موسى بن عياض بن عمرون (ت ٥٤٤هـ)مشارق الأنوار على صحاح الآثار،دار النشر: المكتبة العتيقة ودار التراث ٢ / ٢٨٥، الخوارزمي المُطَرِّزِىّ: ناصر بن عبد السيد أبى المكارم ابن على(ت ٦١٠هـ) المغرب، الناشر: دار الكتاب العربي ( الطبعة: بدون طبعة وبدون تاريخ ) ص ٤٨٩، ابن منظور: محمد بن مكرم بن على، أبو الفضل (ت ٧١١هـ) ط٣، الناشر: دار صادر – بيروت، ١٤١٤ هـ، ١٣ / ٤٥١.

خــاوەن مێــژوو بــەهاو پەیوەنــدی هاوبــەش، مــرۆڤ بــۆلای خــۆی کەمەنــدکێش بکــات و ئەگــەر پێویســتی کــرد بــەرگری لــێ بکــات و، پابەندی بەرانبەر یەک لەنێوان تاک و دەوڵەتدا هـەبێت و، ئـەو ئـەرک و مافانەی کە ئـەو پەیوەندییە پێویستی پابەندبوون پێیـەوەی دەکات، بەلام موسڵمان، لەپاڵ ئەوەی باسکرا، لـەپاڵ تایبەتمەندی ئـەو خاکـەی لەسـەری دەژی و، پێشخسـتنی بەسـەر گشـت خـاکێکی تـردا[1]، هـەموو خاکێکی موسڵمان بەشوینی نیشتەجێبوونی بزانێت، هـەروەها دەکرێت زمــــانی نیشــــتمانی (Languge National) یــــاخود زمــــانی ئــــاین (Language Religious ) بەیەکیانەوە ببستێت[2].

---

[1] بڕوانە: بدوي، أحمد زكي: معجم مصطلحات الرعاية والتنمية الاجتماعية، ط١، دار الكتاب اللبناني ( ١٩٨٧م ) ص ٩٨، الحقيل، سليمان بن عبد الرحمن: الوطنية ومتطلباتها في ضوء تعاليم الإسلام، ط٣، سلسلة كتب التربية الوطنية (١٩٦٦ م ) ص ٣٠، الحصري، ساطع: حول القومية العربية، دار العلم للملايين ( ١٩٨٧م ) ص ٩، أبو دف، محمود خليل و سليمان الزين: دراسات في التربية النوعية، مكتبة آفاق، غزة، ( ٢٠٠٦م ) ص ١٤٢، مان: ميشيل مان: موسوعة العلوم الاجتماعية، ترجمة ؛ عادل الهواري، سعد مصلوح، مكتبة الفلاح ـ الكويت، ١٩٨٤م، ص ١١٠.

[2] حجازى: د. محمود فهمى علم اللغة العربيىا لمؤلف: الناشر: دار غريب للطباعة والنشر والتوزيع ص١٩، ٢٠، عبد الحافظ: سعيد، المواطنة حقوق وواجبات، مركز ماعت للدراسات الحقوقية والدستورية، القاهرة، ٢٠٠٧م، ص ١٠، ميشيل مان: المصدر السابق ١١٠.

# دەروازەی یەکەم:
# هاونیشتمانیبوون، خەسڵەت و بنچینەو دەرئەنجامەکانی و ئەوەی لەفەرموودەدا لەبارەیەوە هاتووە.

## ئەوەی سەبارەت بەنیشتمان هاتووە:

١ـ لەفەرموودەدا هاتووە پێغەمبەر (ρ) لەگەڵ نیشتمانی یەکەمیدا کە مەککەیە دەدوێت و دەفەرمووێت[1]:«وَاللَّهِ إِنَّكِ لَخَيْرُ أَرْضِ اللَّهِ، وَأَحَبُّ أَرْضِ اللَّهِ إِلَى اللَّهِ عَزَّ وَجَلَّ، وَلَوْلَا أَنِّي أُخْرِجْتُ مِنْكِ مَا خَرَجْتُ». واتە: سوێند بەخوا باشترین زەوی خودایت و، خۆشەویسترین زەوی

[1] . رواه عدد كبير من أئمة الحديث في الصحاح والسنن والمسانيد، ينظر على سبيل المثال ابن حنبل: أحمد بن محمد بن حنبل بن هلال بن أسد الشيباني (ت ٢٤١هـ)مسند الإمام أحمد بن حنبل،المحقق: شعيب الأرنؤوط – عادل مرشد، وآخرون، ط١ ،الناشر: مؤسسة الرسالة، ١٤٢١ هـ – ٢٠٠١ م، ٣١ / ١٠ (١٨٧١٥) ابن حبان: محمد بن حبان بن أحمد بن حبان (ت ٣٥٤هـ)الإحسان في تقريب صحيح ابن حبان،ترتيب: الأمير علاء الدين علي بن بلبان الفارسي (ت ٧٣٩ هـ)حققه وخرج أحاديثه وعلق عليه: شعيب الأرنؤوط،ط١ ،الناشر: مؤسسة الرسالة، بيروت، ١٤٠٨ هـ – ١٩٨٨ م، ٩ / ٢٢ (٣٧٠٨ ) ابن البيع: أبو عبد الله الحاكم محمد بن عبد الله بن محمد (ت ٤٠٥هـ)المستدرك على الصحيحين، تحقيق: مصطفى عبد القادر عطا،الناشر: دار الكتب العلمية – بيروت، ١٤١١هـ – ١٩٩٠م،٣ / ٤٨٩ (٥٨٢٧). واللفظ لأحمد والحديث صحيح .

خوایـت لای خـوای گـەورە، ئەگـەر دەرنـەکرابام هـەرگیز جـێم نەدەهێشتی.

٢ـ قَيْلَةَ بِنْتِ مَخْرَمَةَ.. قَالَتْ قَدِمْنَا عَلَى رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَتْ[١]: تَقَدَّمَ صَاحِبِي – تَعْنِي حُرَيْثَ بْنَ حَسَّانَ – وَافِدَ بَكْرِ بْنِ وَائِلٍ، فَبَايَعَهُ عَلَى الْإِسْلَامِ عَلَيْهِ وَعَلَى قَوْمِهِ، ثُمَّ قَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، اكْتُبْ بَيْنَنَا وَبَيْنَ بَنِي تَمِيمٍ بِالدَّهْنَاءِ[٢]، أَنْ لَا يُجَاوِزَهَا إِلَيْنَا مِنْهُمْ أَحَدٌ، إِلَّا مُسَافِرٌ أَوْ مُجَاوِرٌ، فَقَالَ: «اكْتُبْ لَهُ يَا غُلَامُ بِالدَّهْنَاءِ» فَلَمَّا رَأَيْتُهُ قَدْ أَمَرَ لَهُ بِهَا، شُخِصَ بِي وَهِيَ وَطَنِي وَدَارِي، فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنَّهُ لَمْ يَسْأَلْكَ السَّوِيَّةَ مِنَ الْأَرْضِ إِذْ سَأَلَكَ، إِنَّمَا هِيَ هَذِهِ الدَّهْنَاءُ عِنْدَكَ مُقَيَّدُ الْجَمَلِ، وَمَرْعَى الْغَنَمِ، وَنِسَاءُ بَنِي تَمِيمٍ وَأَبْنَاؤُهَا وَرَاءَ ذَلِكَ، فَقَالَ: «أَمْسِكْ يَا غُلَامُ، صَدَقَتِ الْمِسْكِينَةُ، الْمُسْلِمُ أَخُو الْمُسْلِمِ يَسَعُهُمَا الْمَاءُ، وَالشَّجَرُ، وَيَتَعَاوَنَانِ عَلَى الْفَتَّانِ».

واتە: قەیلەی کچی مەخرەمە دەڵێت.. چوینە خزمەتی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم)، دەڵێت: هاوڕێکەم –مەبەستی حورەیسی کوڕی حەسانە– کەلەلایەن بکری کوڕی وائیلەوە نێردرابوو، بەیعەتی ئیسلامبوونی خۆی و هۆزەکەی دا، پاشان وتی: ئەی پێغەمبەری خوا،

---

[١] رواه عدد كبير من أئمة الحديث، ينظر: السِّجِسْتاني؛ أبو داود سليمان بن الأشعث بن إسحاق بن بشير (ت ٢٧٥هـ)سنن أبي داود،المحقق: شعَيب الأرنؤوط – محَمَّد كامِل قره بللي، ط١، الناشر: دار الرسالة العالمية، ١٤٣٠ هـ – ٢٠٠٩ م، ٤ / ٦٧٧ (٣٠٧٠ ) الطبراني: سليمان بن أحمد بن أيوب بن مطير اللخمي (ت ٣٦٠هـ) المعجم الكبير، المحقق: حمدي بن عبد المجيد السلفي،ط٢،دار النشر: مكتبة ابن تيمية – القاهرة، ٢٥ / ١٠، والحديث تكلم في سنده.

[٢] **شوین وجێگایەکە لەبنی تەمیم، بڕوانە:** الزمخشري: محمود بن عمرو بن أحمد(ت ٥٣٨ هـ) الجبال والأمكنة والمياه، المحقق: د/ أحمد عبد التواب عوض المدرس بجامعة عين شمس، الناشر: دار الفضيلة للنشر والتوزيع – القاهرة، عام النشر: ١٣١٩ هـ – ١٩٩٩ م، ص ١٢٩.

لەبارەی دەهنائەوە کە لەنێوان ئێمەو بەنی تەمیمدایە، بنووسە بۆمان کە هیچ کەسیان سنوورمان نەبەزێنن، مەگەر بەگەشت یان بەرێبواری بێت، فەرمووی: ئەی گەنج دەهنائیان بۆ بنووسە، کاتێ بینم فەرمان بەوە دەکات، نیگەران بووم خۆم نەگرت، چونکە ئەوێ ناوچەو ماڵمان بوو، وتم: ئەی پێغەمبەری خوا داوای زەوییە مامناوەندەکەی لێ نەکردوویت، ئەوەی داوای دەکات لەوڕگای وشترو مەڕو ماڵاتەوە ئەوەی لەوێ نیشتەجی بێت ناتوانێت بەجێی بهێڵێت بەهۆی پێویستبوونیەوە پێی وئافرەتان ومناڵانی بەنی تەمیم لەپشت ئەوەوەن، پێغەمبەری خوا فەرمووی: بگرە ئەی گەنج ئەو ئافرەتە راستی وت، موسڵمان برای موسڵمانەو ئاو و دارا بەشیان دەکات و، هاریکاری یەک بن لەدژی ئاشوب.

٣. عَنِ ابْنِ مَسْعُودٍ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، قَالَ[١]: «لَقِيتُ لَيْلَةَ أُسْرِيَ بِي إِبْرَاهِيمَ، وَمُوسَى، وَعِيسَى»، قَالَ: " فَتَذَاكَرُوا أَمْرَ السَّاعَةِ...حَتَّى إِنَّ الْحَجَرَ، وَالشَّجَرَ لَيَقُولُ: يَا مُسْلِمُ، إِنَّ تَحْتِي كَافِرًا، فَتَعَالَ فَاقْتُلْهُ، قَالَ: فَيُهْلِكُهُمُ اللَّهُ، ثُمَّ يَرْجِعُ النَّاسُ إِلَى بِلَادِهِمْ وَأَوْطَانِهِمْ». واتە: لە ئیبن مەسعودەوە، لەپێغەمبەری خواوە (صلی الله علیه وسلم) فەرموویەتی: لەشەوی ئیسرادا بەئیبراهیم و، موساو، عیسا گەیشتم، فەرمووی: کاری رۆژیی دواییان هاتەوە یاد... تەنانەت بەردو، داریش دەڵێن: ئەی موسڵمان ئەوە کافرە لە پەنامایە، وەرە بیکوژە، فەرمووی: خوای گەورە لەناویان دەبات، پاشان خەڵکی دەگەڕێنەوە بۆ وڵات و نیشتمانی خۆیان.

---

[١] مسند الإمام أحمد ٦ / ١٩ (٣٥٥٦).

٤. قَالَ عَامِرُ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ[1] : " إِنَّمَا أَجِدُنِي آسِفًا عَلَى الْبَصْرَةِ لِأَرْبَعِ خِصَالٍ: تَجَاوُبُ مُؤَذِّنِيهَا , وَظَمَأُ الْهَوَاجِرِ , وَلِأَنَّ بِهَا أَخْدَانِي , وَلِأَنَّ بِهَا وَطَنِي ". واتە: عامری کوڕی عەبدوڵلا دەڵێت: دەمبینیت لەبەر چوار خەسڵەت نیگەرانم بۆ بەسرە: تەبایی زانایانی (یاخود دەنگدانەوەی بانگدەرانی)، تینیبوونی کاتی گەرمای، شوێنی رەفیقو هاوڕێیانمە، نیشتمان و جێگامە.

٥. وَأَبُو سَعِيدٍ الْخُدْرِيُّ، يَظْعَنُونَ عَنْ أَوْطَانِهِمْ، وَيَنْتَقِلُونَ عَنْ بُلْدَانِهِمْ [2]. واتە: ئەبو سەعیدی خودریش، لەنیشتمانی خۆیان دەڕۆن و، ولاتەکانیان بەجێ دەهێڵن.

٦ـ بەرگری لەنیشتمانیش بەحەق واجبێکی شەرعییە، وەک ئەوەی زەوی و نیشتمانەکەی دستدرێژی کرابێتە سەر یاخود بەهێز لێی دەرکرابێت.

خوای گەورە دەفەرموویت[3]: ﴿ أَلَمْ تَرَ إِلَى الْمَلأِ مِنْ بَنِي إِسْرائيلَ مِنْ بَعْدِ مُوسَى إِذْ قَالُوا لِنَبِيٍّ لَهُمُ ابْعَثْ لَنَا مَلِكاً نُقَاتِلْ فِي سَبِيلِ اللَّهِ قَالَ هَلْ عَسَيْتُمْ إِنْ كُتِبَ عَلَيْكُمُ الْقِتَالُ أَلَّا تُقَاتِلُوا قَالُوا وَمَا لَنَا أَلَّا نُقَاتِلَ فِي سَبِيلِ اللَّهِ وَقَدْ أُخْرِجْنَا مِنْ دِيَارِنَا وَأَبْنَائِنَا﴾.

---

[1] ابن أبي شيبة، عبد الله بن محمد بن إبراهيم (ت ٢٣٥هـ) الكتاب المصنف في الأحاديث والآثار، المحقق: كمال يوسف الحوت، ط١،الناشر: مكتبة الرشد – الرياض، ١٤٠٩م،٧ / ١٧٦ (٣٥١١٠).

[2] ابن بطة: أبو عبد الله عبيد الله بن محمد بن محمد بن حمدان (ت ٣٨٧هـ)الإبانة الكبرى لابن بطة، المحقق: رضا معطي، وعثمان الأثيوبي، ويوسف الوابل، والوليد بن سيف النصر، وحمد التويجري،الناشر: دار الراية للنشر والتوزيع، الرياض ١ / ٢٦٠ ( ٩٦ ).

[3] سورة البقرة ؛ آية ٢٤٦.

## خۆشەویستی نیشتمان خۆڕسکە:

لـەو کـارە خۆڕسـکانەی کـە خـوای گـەورە لـە دڵـی مرۆڤەکانـدا چاندوویەتی خۆشـەویستیەتی بۆ نیشتمانەکەی و ئەو خاکەی لەسـەری لەدایکبووەو، گاگۆڵکێی لەسەر کردووەو تێیدا ژیاوەو لەخێروبێرەکەی خواردووەو، خۆشترین یادەورەیەکانی ژیانی تیدا تۆمار کردووە.

خـــوای گـــەورە دەفـــەرموویێت[1]: ﴿ وَلَوْ أَنَّا كَتَبْنَا عَلَيْهِمْ أَنِ اقْتُلُواْ أَنفُسَكُمْ أَوِ اخْرُجُواْ مِن دِيَارِكُم مَّا فَعَلُوهُ إِلاَّ قَلِيلٌ مِّنْهُمْ وَلَوْ أَنَّهُمْ فَعَلُواْ مَا يُوعَظُونَ بِهِ لَكَانَ خَيْرًا لَّهُمْ وَأَشَدَّ تَثْبِيتًا ﴾.

لەعائیشـەوە (خوا لێی ڕازی بێت) گێڕاویانەتـەوە[2]، کاتێ پێغەمبـەر (صـلی اللــه علیــه وســلم) هاتــە مەدینــە ئەبوبــەکرو بــیلال تووشــی تاوئازارێکی زۆر بوون, بیلال کەتاکەی دادەبەزی دەنگی گریانی بەرز دەبوویەوەو دەیوت:

**أَلاَ لَيْتَ شِعْرِي هَلْ أَبِيتَنَّ لَيْلَةً　　بِوَادٍ وَحَوْلِي إِذْخِرٌ وَجَلِيلُ**
**وَهَلْ أَرِدَنْ يَوْمًا مِيَاهَ مَجَنَّةٍ　　وَهَلْ يَبْدُوَنْ لِي شَامَةٌ وَطَفِيلُ**

دەیوت: خوایە نەفرەت لەشـەیبەی کوڕی ڕەبیعـەو عوتبـەی کـوڕی ڕەبیعەو، ئومەیەی کوڕی خەلەف بێت کـەئاوا لـەخاکی خۆمـان بـەرەو خـاکی پـەتا وەدەریـان نـاین، پاشـان پێغەمبـەری خـوا (صـلی اللـه علیـه وسـلم) فـەرمووی: «اللَّهُمَّ حَبِّبْ إِلَيْنَا المَدِينَةَ كَحُبِّنَا مَكَّةَ أَوْ أَشَدَّ، اللَّهُمَّ

---

[1] سورة النساء ؛ آية ٦٦.

[2] البخاري: محمد بن إسماعيل أبو عبدالله ( ت ٢٥٦ هـ )الجامع المسند الصحيح المختصر من أمور رسول الله صلى الله عليه وسلم وسننه وأيامه = صحيح البخاري،المحقق: محمد زهير بن ناصر الناصر، ط١ ، الناشر: دار طوق النجاة (مصورة عن السلطانية بإضافة ترقيم ترقيم محمد فؤاد عبد الباقي)، ١٤٢٢هـ، ٣ / ٢٣ ( ١٨٨٩).

بَارِكْ لَنَا فِي صَاعِنَا وَفِي مُدِّنَا، وَصَحِّحْهَا لَنَا، وَانْقُلْ حُمَّاهَا إِلَى الجُحْفَةِ».
واتــه: (خودایــا خــاکی مەدینــە لامــان خۆشەویســت بکــە وەک خۆشەویستیمان بۆ مەککە یان زیاتر، خودایا پیت وفەڕ بخە کێشان و پێوانمانەوەو، ڕاستی بکەرەوە بۆمان و، پەتاکەشی لەناو ببە.

دەڵێت: کەچووینە مەدینە لەهەموو خاکێکی تری خوا پەتای زیاتر بوو، دەڵێت: لەشیو ودۆڵەکانی مەدینەدا ئاوی بۆگەن دەڕۆشت.

لەزوهریەوە وتوویەتی[1]: ئەصیلی غیفاری لەمەککە بەرلەوەی حیجاب لەسەر خێزانەکانی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرز بکرێت هاتە خزمەت پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم)، عائیشە پێی وت: مەککەت چۆن بینی؟

وتی: هەموو دەوروبەری مەدینە سەوز بووەو، شیوەکانی بەلافاو پڕ بووەو، گیایەکەی پەلکی کردووەو، گەڵای درەختەکانی سەوزو گەورە بووە -فەرموودەکە.

---

[1] الأزدي: أبو الفتح محمد بن الحسين بن أحمد بن عبد الله بن بريدة الموصلي (ت ٣٧٤هـ)كتاب ذكر اسم كل صحابي روى عن رسول الله صلى الله عليه وسلم أمراً أونهياً ومن بعده من التابعين وغيرهم ممن لا أخ له يوافق اسمه من نقلة الحديث من جميع الأمصار، المحقق: أبو شاهد ضياء الحسن محمد السلفي، الناشر: دار ابن حزم، ص ٢٧ ( ٧ ) ابن حجر العسقلاني: الإصابة في تمييز الصحابة، تحقيق: عادل أحمد عبد الموجود وعلى محمد معوض،ط١ ،الناشر: دار الكتب العلمية – بيروت،١٤١٥ هـ، ١ / ٢٤٤، السخاوي: المقاصد الحسنة ص ٢٩٨ ( ٣٨٦) المتقي الهندي: علاء الدين علي بن حسام الدين ابن قاضي خان (ت ٩٧٥هـ) كنز العمال في سنن الأقوال والأفعال، المحقق: بكري حياني – صفوة السقا،ط٥ ،الناشر: مؤسسة الرسالة، ١٤٠١هـ/١٩٨١م، ١٢ / ٢١٠ (٣٤٧٠٢) العجلوني: كشف الخفا ١ / ٣٩٩.

رواية الأزدي عن:حدثنا عبد الله بن سعيد بن يحيى حدثنا أحمد بن بكار بن أبي ميمونة حدثنا عبد الله بن سمية عن محمد بن عبد الرحمن القرشي عن بديح، ورواية الخطّابيّ في غريب الحديث، من طريق إبراهيم بن محمد بن عبد العزيز، عن أبيه، عن الزّهريّ.

لەوەی لەفەرموودەکەدا هاتووە: پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی: «حسبك يا أُصَيْلُ، لا تحزنّا»، واتە: بەسیەتی ئوصەیل خەمبارمان مەکە.

ئەبو موساش لە (الذيل) لەڕوویەکی ترەوە هێناویەتی، لەڕێگەی ئەحمەدی کوڕی بەکاری کوڕی ئەبی میمونە، لەعەبدوڵڵای کوڕی سەعید، لەمحەمەدی کوڕی عەبدولڕەحمانی قرشی، لە بەدیح: کەکوڕی سدرەی سەلەمیە، دەڵێت: ئوصیلی هەزلی هات، بەکورتی باسی کردووە، تێیدا هاتووە: پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی: « وَيْها يا أُصَيْلُ دع القلوب تقرّ»، واتە: ئوصەیل بەسیەتی لێ گەڕێ با دڵەکان ئارام بن.

ئەصمەعی دەڵێت، وتی: گوێم لەدەشتەکییەک بوو دەیووت[1]: ئەگەر ویستت کەسێک هەڵبسەنگێنیت، سەیر بکە بزانە چۆن بیری نیشتمانی دەکات و، پەرۆشە بۆ براکانی و، گریانی بۆ ئەو تەمەنەی بەسەری بردووە چۆنە.

هەندێک بۆ ئەوە چوون کەئەو فەرموودەی پێشوو فەرموودەی خۆشەویستی پێغەمبەر (ρ) بۆ مەککە هیچ بەڵگەیەکی تێدا نیە لەسەر خۆشەویستی نیشتمان چونکە خۆشەویستیەکەی بۆ مەککە لەبەر ئەوە بووە کە خۆشەویسترین زەوی بووە لای خوای گەورە،

[1] الدينوري المالكي: أبو بكر أحمد بن مروان (ت ٣٣٣هـ)المجالسة وجواهر العلم، المحقق: أبو عبيدة مشهور بن حسن آل سلمان، الناشر: جمعية التربية الإسلامية (البحرين – أم الحصم )، دار ابن حزم (بيروت – لبنان، ١٤١٩هـ، ٢، ٢٠٩ ( ٣٣٢) السخاوي: شمس الدين أبو الخير محمد بن عبد الرحمن (ت ٩٠٢هـ) المقاصد الحسنة في بيان كثير من الأحاديث المشتهرة على الألسنة، المحقق: محمد عثمان الخشت،ط١،

الناشر: دار الكتاب العربي – بيروت، ١٤٠٥ هـ – ١٩٨٥م، ١ / ٢٩٧ ( ٣٨٦ ).

ئەمەش هەرکەس سەرنجی فەرموودەکەو هی تریش بدات دەزانێت ورد نیە، بەڵام نیشتمانپەرستی ودەمارگیری بۆی لەئیسلامداو لای موسڵمان جێی نابێتەوە[1].

لەفەرموودەکەوە لەوەرەقەی کوڕی نەوفلەوە کاتێ هەواڵیدا بەپێغەمبەر (ρ)لەمەککە دەریدەکەن، پێغەمبەر (ρ) فەرمووی: "بۆ ئایا من لەمەککە دەردەکرێم".

پێشەوا عراقی لەسوهەیلییەوە هێناویەتی[2]: "لەمەدا بەڵگە لەسەر خۆشەویستی نیشتمان و سەختی بەجێهێشتنی لەسەر دەروون هەیە"،

لهفەرموودەی ڕاست و دروست (صحیح)دا هاتووە[3]: پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) کەلەسەفەر دەهاتەوە، ڕێگا بەرزەکانی مەدینەی ببینیایە، وشترەکە خێراتر دەکرد[4]، ئەگەر وڵاخیش بووایە دەیجوڵاند پەلەبکات.

---

[1] الداودي: أبو عبد الرحمن، يوسف بن جودة يس يوسف، الجامع الصحيح فِيمَا كَانَ عَلى شَرطِ الشَيْخَيْنِ أو أحَدِهِمَا وَلم يُخَرِّجَاهُ،ط١،الناشر: دار قباء للطباعة – القاهرة،، ١٤٢٩ هـ – ٢٠٠٨ م، ٢ / ٣٥١ ( ٥٧٠).

[2] العراقي: أبو الفضل زين الدين عبد الرحيم بن الحسين بن عبد الرحمن (ت ٨٠٦هـ)طرح التثريب في شرح التقريب (المقصود بالتقريب: تقريب الأسانيد وترتيب المسانيد)أكمله ابنه: أحمد بن عبد الرحيم بن الحسين الكردي الرازياني ثم المصري، أبو زرعة ولي الدين، ابن العراقي (ت ٨٢٦هـ)الناشر: الطبعة المصرية القديمة – وصورتها دور عدة منها (دار إحياء التراث العربي، ومؤسسة التاريخ العربي، ودار الفكر العربي) ٤ / ١٩٦، و ينظر كذلك ابن حجر العسقلاني: أحمد بن علي بن حجر ( ت ٨٥٢ هـ ) فتح الباري شرح صحيح البخاري، قام بإخراجه وصححه وأشرف على طبعه: محب الدين الخطيب عليه تعليقات العلامة: عبد العزيز بن عبد الله بن باز، الناشر: دار المعرفة – بيروت، ١٣٧٩م، ٣ / ٦٢١..

[3] صحيح البخاري ٣ / ٨ ( ١٨٠٢).

[4] بدر الدين العينى: محمود بن أحمد بن موسى بن أحمد بن (ت ٨٥٥هـ) عمدة القاري شرح صحيح البخاري الناشر: دار إحياء التراث العربي – بيروت، ١٠ / ١٣٥ ( ٢٠٨١).

بـەدرەدینی عـەینی قسـە لەسـەر فەرموودەکـە دەکـات و دەڵێـت[1]: بەڵگە لەسەر فەزڵی مەدینەو لەسەر رەوایەتی خۆشەویستی نیشتمان پەرۆشی بۆی تێدایە".

فەرموودەی: "حُبُّ الْوَطَنِ مِنَ الإيْمَانِ"، واتە: خۆشەویستی نیشتمان لەباوەڕەوەیە، ئەم فەرموودەیە کێویلەو هەڵبەستراو(موضوع)ە[2]، بەڵام واتاکەی بەو مەرجەی باسکرا قبوڵکراوە[3].

ئەبوتەمام وتوویەتی[4]:

نَقِّلْ فؤادَكَ حَيْثُ شئتَ مِنَ الهَوَى ... مَا الْحُبُّ إلاَّ لِلْحَبِيبِ الأَوَّلِ

كَمْ مَنْزَلٍ فِي الأرْضَ يَأْلَفُهُ الفَتَى ... وَحَنِينُهُ أَبَداً لأَوَّل مَنْزِلِ

---

[1] ابن حجر العسقلاني: أحمد بن علي بن حجر (ت ٨٥٢ هـ) فتح الباري شرح صحيح البخاري، قام بإخراجه وصححه وأشرف على طبعه: محب الدين الخطيب عليه تعليقات العلامة: عبد العزيز بن عبد الله بن باز، الناشر: دار المعرفة – بيروت، ١٣٧٩م، ٣ / ٦٢١، وينظر كذلك: بدر الدين العينى: المصدر السابق مع المجلد والصفحة.

[2] السخاوي: المقاصد الحسنة ١ / ٢٩٧ (٣٨٦) ابن المِبْرَد الحنبلي: يوسف بن حسن بن أحمد بن حسن (ت ٩٠٩ هـ) التخريج الصغير والتحبير الكبير (مطبوع ضمن مجموع رسائل ابن عبد الهادي)عناية: لجنة مختصة من المحققين بإشراف: نور الدين طالب، ط١، الناشر: دار النوادر، سوريا، ١٤٣٢ هـ – ٢٠١١ م، رقم الحديث ٣٨٣ حرف الحاء، الحوت: محمد بن محمد درويش (ت ١٢٧٧هـ)أسنى المطالب في أحاديث مختلفة المراتب، المحقق: مصطفى عبد القادر عطا،ط١، الناشر: دار الكتب العلمية – بيروت، ١٤١٨ هـ –١٩٩٧م، ١ / ١٢٣ (٥٥١)

[3] السخاوي: المقاصد الحسنة ١ / ٢٩٧، العجلوني: إسماعيل بن محمد بن عبد الهادي(ت ١١٦٢هـ) كشف الخفاء ومزيل الإلباس، تحقيق: عبد الحميد بن أحمد بن يوسف بن هنداوي، ط١، الناشر: المكتبة العصرية، ١٤٢٠هـ – ٢٠٠٠م، ١ / ٣٩٨.

[4] الآمدي: أبو القاسم الحسن بن بشر (ت ٣٧٠ هـ) الموازنة بين شعر أبي تمام والبحتري، المجلد الأول والثاني: تحقيق/ السيد أحمد صقر،ط٤،الناشر: دار المعارف ٢ / ٥٦.

## خەسڵەتەکانی هاونیشتمانیبوونی چاك:

هەرکەس لەسەر خاکێک لەدایکبوو یان ژیا، وەک پێویست مەرج نیە هاوولاتیەکی چاک بێت بۆی، لە مێژووی مرۆڤایەتیدا چەند کەسمان بینی یان لەبارەیەوە خوێندومانەتەوە لەپێناوی دوژمنانی نیشتمانەکەیاندا ناپاکیان لەنیشتمان و ولات و ویژدانی خۆیان کردووە، خوای گەورە دەفەرموویت[1]: ﴿وَمِنَ النَّاسِ مَن يُعْجِبُكَ قَوْلُهُ فِي الْحَيَاةِ الدُّنْيَا وَيُشْهِدُ اللَّهَ عَلَى مَا فِي قَلْبِهِ وَهُوَ أَلَدُّ الْخِصَامِ (٢٠٤) وَإِذَا تَوَلَّى سَعَى فِي الأَرْضِ لِيُفْسِدَ فِيهَا وَيُهْلِكَ الْحَرْثَ وَالنَّسْلَ وَاللَّهُ لاَ يُحِبُّ الفَسَادَ (٢٠٥) وَإِذَا قِيلَ لَهُ اتَّقِ اللَّهَ أَخَذَتْهُ الْعِزَّةُ بِالإِثْمِ فَحَسْبُهُ جَهَنَّمُ وَلَبِئْسَ الْمِهَادُ (٢٠٦) وَمِنَ النَّاسِ مَن يَشْرِي نَفْسَهُ ابْتِغَاءَ مَرْضَاتِ اللَّهِ وَاللَّهُ رَؤُوفٌ بِالْعِبَادِ (٢٠٧)﴾.

کەواتە ئەبێت بەپێی شەریعەت گرنگترین ئەو پێوەرانە چی بێت کە هاونیشتمانی چاکی لە هاونیشتمانی خراپ پێ جیا بکرێتە؟.

کۆمەڵێک خەسڵەت هەیە ئەگەر لەمرۆڤدا هەبوو دەیکاتە هاونیشتمانییەکی باشی بەسوود بۆ کۆمەڵگاو نیشتمانەکەی، بگرە بۆ تێکڕای مرۆڤایەتی، گرنگترینی ئەو خەسڵەتانەش بەبۆچوونی ئێمە، لەپاش ئیمان، ئەمانەیە:

١ـ سپاردەپارێزی (الامانة): لەگرنگترینی خەسڵەتەکانە کە پێویستە لە هاونیشتمانی چاکدا هەبێت، کەبوونی ئاسمانەکان و زەوی لەسەر راوەستاوە، خوای گەورە دەفەرموویت[2]: ﴿ إِنَّا عَرَضْنَا الأَمَانَةَ عَلَى

---

[1] سورة البقرة ؛ آية ٢٠٤ ـ ٢٠٧.

[2] سورة الأحزاب ؛ آية ٧٢.

السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ وَالْجِبَالِ فَأَبَيْنَ أَن يَحْمِلْنَهَا وَأَشْفَقْنَ مِنْهَا وَحَمَلَهَا الإِنسَانُ إِنَّهُ كَانَ ظَلُومًا جَهُولاً﴾.

پێغەمبەریش (ρ) فەرموویەتی[1]:« أَدِّ الْأَمَانَةَ إِلَى مَنِ ائْتَمَنَكَ، وَلَا تَخُنْ مَنْ خَانَكَ». واتە: سپاردە بگەڕێنەرەوە بۆ ئەو کەسەی پێی سپاردوویت، ناپاکی لەکەسێک مەکە کەناپاکی لەگەڵ کردوویت.

٢ــ ئاوەدانکردنەوە (التعمیر): باوەڕبوون بەوەی کە بوون و دروستکردنی بۆ ئاوەدانکردنەوەو چاککردنی زەوی بووە، نەک وێرانکردنی، خوای گەورە هەموو تواناو پێویستیەکی بەجێهێنانی ئەو رۆڵەی تیدا فەراهەم هێناوەو، دەفەرموویت[2]: ﴿ هُوَ أَنشَأَكُم مِّنَ الأَرْضِ وَاسْتَعْمَرَكُمْ فِيهَا فَاسْتَغْفِرُوهُ ثُمَّ تُوبُواْ إِلَيْهِ إِنَّ رَبِّي قَرِيبٌ مُّجِيبٌ ﴾، لەئایەتێکی تردا فەرموویەتی[3]:﴿ وَلاَ تُفْسِدُواْ فِي الأَرْضِ بَعْدَ إِصْلاَحِهَا وَادْعُوهُ خَوْفًا وَطَمَعًا إِنَّ رَحْمَةَ اللَّهِ قَرِيبٌ مِّنَ الْمُحْسِنِينَ ﴾.

٣ـ دوورکەوتنەوە لەخراپەکاری، بەهەموو جۆرەکانیەوە کەزیان بەتاک و کۆمەڵگاو نیشتمان ومرۆڤایەتی دەگەیەنێت.

---

[1] السِّجِسْتاني: أبو داود سليمان بن الأشعث بن إسحاق بن بشير (ت ٢٧٥هـ)سنن أبي داود، المحقق: شعَيب الأرنؤوط – محَمَّد كامِل قره بللي،ط١،الناشر: دار الرسالة العالمية، ١٤٣٠ هـ – ٢٠٠٩ م، ٥ / ٣٩٤.

[2] سورة هود ؛ آية ٦٠.

[3] سورة هود ؛آية ٥٦.

خـوای گـەورە دەفـەرموویت[1]: ﴿ فَأَوْفُوا الْكَيْلَ وَالْمِيزَانَ وَلَا تَبْخَسُوا النَّاسَ أَشْيَاءَهُمْ وَلَا تُفْسِدُوا فِي الْأَرْضِ بَعْدَ إِصْلَاحِهَا ذَلِكُمْ خَيْرٌ لَكُمْ إِنْ كُنْتُمْ مُؤْمِنِينَ﴾.

لەئایـەتێکی تـردا فەرموویـەتی[2]: ﴿ أَنَّهُ مَن قَتَلَ نَفْسًا بِغَيْرِ نَفْسٍ أَوْ فَسَادٍ فِي الأَرْضِ فَكَأَنَّمَا قَتَلَ النَّاسَ جَمِيعًا وَمَنْ أَحْيَاهَا فَكَأَنَّمَا أَحْيَا النَّاسَ جَمِيعًا وَلَقَدْ جَاءَتْهُمْ رُسُلُنَا بِالبَيِّنَاتِ ثُمَّ إِنَّ كَثِيرًا مِّنْهُم بَعْدَ ذَلِكَ فِي الأَرْضِ لَمُسْرِفُونَ﴾.

٤ــ خۆشەویسـتی چاکـەو باشـبوون بـۆ کەسـانی تـرو چانـدنی لـە دەروونیاندا: هاوولاتی چاک، هەروەک چۆن باشەو چاکەی بۆ خۆی و خیزانەکـەی پێخۆشــەو، بــەئاواتی دەخوازێـت، بەهەمانشـێوە پێـی خۆشە ئەو خێرو چاکەیە هـەموو هاوسێ و خـەڵکی نیشتمانەکەی و تیکڕایی مرۆڤایەتیش بگرێتەوە.

خوای گەورە دەفەرموویت[3]:﴿وَقَالَ الَّذِي آمَنَ يَا قَوْمِ اتَّبِعُونِ أَهْدِكُمْ سَبِيلَ الرَّشَادِ (٣٨) يَا قَوْمِ إِنَّمَا هَذِهِ الْحَيَاةُ الدُّنْيَا مَتَاعٌ وَإِنَّ الآخِرَةَ هِيَ دَارُ الْقَرَارِ (٣٩) مَنْ عَمِلَ سَيِّئَةً فَلا يُجْزَى إِلاَّ مِثْلَهَا وَمَنْ عَمِلَ صَالِحًا مِّن ذَكَرٍ أَوْ أُنثَى وَهُوَ مُؤْمِنٌ فَأُوْلَئِكَ يَدْخُلُونَ الْجَنَّةَ يُرْزَقُونَ فِيهَا بِغَيْرِ حِسَابٍ (٤٠) وَيَا قَوْمِ مَا لِي أَدْعُوكُمْ إِلَى النَّجَاةِ وَتَدْعُونَنِي إِلَى النَّارِ (٤١) ﴾.

---

[1] سورة الأعراف ؛آية ٨٥.

[2] سورة المائدة ؛آية ٣٢.

[3] سورة غافر ؛ آية ٣٨ ـ ٤١.

پێغەمبەریش (ρ) فەرموویەتی[1]: « لَا يُؤْمِنُ أَحَدُكُمْ حَتَّى يُحِبَّ لأَخِيهِ مَا يُحِبُّ لِنَفْسِهِ »، واتە: ((باوەڕی هیچ کەستان تەواو نابێت تا ئەوەی بۆ خۆی پێی خۆشە بۆ براکەشی پێی خۆش بێت)).

لەگێڕانەوەیەکی تردا[2]:« ويكرهُ له ما يكرهُ لنفسِه»، واتە: ئەوەی بۆ خۆی پێی ناخۆشەو بۆ ئەویش پێی ناخۆش بێت.

٥- هاریکاریی وبرابەتی و پشتیوانی لەسەر خێرو چاکەو تەقواو، دوورکەوتنەوە لەپێچەوانەی ئەوانە.

خوای گەورە دەفەرمووێت[3]: ﴿ وَتَعَاوَنُواْ عَلَى الْبرِّ وَالتَّقْوَى وَلاَ تَعَاوَنُواْ عَلَى الإِثْمِ وَالْعُدْوَانِ وَاتَّقُواْ اللَّهَ إِنَّ اللَّهَ شَدِيدُ الْعِقَابِ﴾.

لەفەرموودەیەکیشدا هاتووە[4]: «مَنْ نَفَّسَ عَنْ أَخِيهِ كُرْبَةً مِنْ كُرَبِ الدُّنْيَا نَفَّسَ اللَّهُ عَنْهُ كُرْبَةً مِنْ كُرَبِ يَوْمِ الْقِيَامَةِ، وَمَنْ سَتَرَ عَلَى مُسْلِمٍ سَتَرَ اللَّهُ عَلَيْهِ فِي الدُّنْيَا وَالْآخِرَةِ، وَمَنْ يَسَّرَ عَلَى مُسْلِمٍ يَسَّرَ اللَّهُ عَلَيْهِ فِي الدُّنْيَا وَالْآخِرَةِ، وَاللَّهُ فِي عَوْنِ الْعَبْدِ مَا كَانَ الْعَبْدُ فِي عَوْنِ أَخِيهِ »، واتە: هەرکەسێک نارەحەتییەک لەنارەحەتیەکانی دونیا لەسەر براکەی لاببات ئەوا خوای گەورە نارەحەتیەک لەنارەحەتیەکانی رۆژی دوایی لەسەر لادەبات، هەرکەس کەم وکورتی موسڵمانێک دابپۆشێت ودەری

---

[1] صحيح البخاري ١ / ١٢ ( ١٣ ).

[2] البغدادي المخَلِّص: محمد بن عبد الرحمن بن العباس(ت ٣٩٣هـ) المخلصيات وأجزاء أخرى لأبي طاهر المخلص، المحقق: نبيل سعد الدين جرار،ط١،الناشر: وزارة الأوقاف والشؤون الإسلامية لدولة قطر، ١٤٢٩ هـ - ٢٠٠٨ م، ٣ / ٦٩ (٢٠١٢).

[3] سورة المائدة ؛آية ٢.

[4] البيهقي: أحمد بن الحسين بن علي بن موسى (ت ٤٥٨هـ) الآداب للبيهقي،ط١،الناشر: مؤسسة الكتب الثقافية، بيروت - لبنان، ١٤٠٨ هـ - ١٩٨٨ م، ص ٣٨ ( ) ٩٢.

نـەخات، خـوای گـەورە لـەدونیاو ڕۆژیـی دوایشـدا کـەم وکورتیـەکانی دادەپۆشێت، خوای گەورە بەهانای بەندەکەیەوە دەچێت لەبەر ئەوەی بەندەکەی بەهانای براکەیەوە چووە.

٦ـ خۆشەویستی کارو باش ئەنجامدانی: هاونیشتمانی چاک شەو و ڕۆژی لەخزمەتی ئاینەکەی وخۆی وخێزانەکەی و کۆمەڵگاو نیشتمانەکەیدا بەسەر دەبات، لەکارکردنیدا دڵسۆزەو بەباشی ئەنجامی دەدات، باشێتی لەنێوانیاندا لەسەر بنەمای ڕادەی کارکردنیانە بۆ بەرژەوەندی خەڵک[1].

هەموو پێغەمبەران (υ) خاوەن پیشەو کار بوون، لەمبارەیەوە: ((دەگێڕنەوە کەئەیوب بەرگدروو، زەکەریا دارتاش بووەو، خوای گەورە باسی موسای کردووە کەبەکرێ کاری شوانێتی مەڕەکانی شوعەیب (سەلامی خوای لەسەر بێت) کردووە)).

تەنانەت پێغەمبەریشمان محەمەد (ρ) شوانێتی کردووە[2]، پاشان کاری بازرگانی کردووە[3] ((خوای گەورە هیچ پێغەمبەرێکی نەناردووە شوانێتی نەکردبێت))، هاوەڵانی وتیان: ئەی تۆ؟ فەرمووی: ((بەڵێ منیش بەکرێ شوانیم بۆ خەڵکی مەککە دەکرد)).

کار گرنگترین پایەی پێوەرە لەپێشخستن و دواکەوتن لەبەردەم حوکمی ئاین ودەوڵەتدا، لەفەرموودەی صەحیحدا لەپێغەمبەرەوە (ρ)

---

[1] المبارك: محمد المبارك، نظام الإسلام ؛ الحكم والدولة، ط٢، دار الفكر. بيروت ١٣٩٥هـ / ١٩٧٤م، ص ١١٤.

[2] صحيح البخاري ٣ / ٨٨ (٢٢٦٢).

[3] ابن الأثير: مجد الدين أبو السعادات المبارك بن محمد (ت ٦٠٦هـ)جامع الأصول في أحاديث الرسول، تحقيق: عبد القادر الأرنؤوط،ط١،الناشر: مكتبة الحلواني – مطبعة الملاح – مكتبة دار البيان، ١٢ / ٩١.

دەگێڕنـەوە[1] فەرموویـەتی: «إِنَّ اللهَ لَا يَنْظُرُ إِلَى صُوَرِكُمْ وَأَمْوَالِكُمْ، وَلَكِنْ يَنْظُرُ إِلَى قُلُوبِكُمْ وَأَعْمَالِكُمْ»، واتە: خوای گەورە سەیری شێوەو ماڵ و سامانتان ناكات، بەڵكو سەیری دڵ و كردەوەتان دەكات.

٧ـ زانین وتێگەیشتن: ئیسلام داوا لـەهاووڵاتیانی دەكات كە ئەندامێكی بەسـوود بـن بـۆ كۆمەڵگاكـەیان، خـاوەن زانـین وتێگەیشـتن بـن، نـەك نەخویندەواربن و تەنها بەخەیاڵ وئاواتەوە بژین.

خـوای گـەورە دەفـەرموویێت[2]: ﴿فَفَهَّمْنَاهَا سُلَيْمَانَ وَكُلاًّ آتَيْنَا حُكْمًا وَعِلْمًا وَسَخَّرْنَا مَعَ دَاوُودَ الْجِبَالَ يُسَبِّحْنَ وَالطَّيْرَ وَكُنَّا فَاعِلِينَ (٧٩) وَعَلَّمْنَاهُ صَنْعَةَ لَبُوسٍ لَّكُمْ لِتُحْصِنَكُم مِّن بَأْسِكُمْ فَهَلْ أَنتُمْ شَاكِرُونَ (٨٠) وَلِسُلَيْمَانَ الرِّيحَ عَاصِفَةً تَجْرِي بِأَمْرِهِ إِلَى الأَرْضِ الَّتِي بَارَكْنَا فِيهَا وَكُنَّا بِكُلِّ شَيْءٍ عَالِمِينَ(٨١) ﴾.

٨ـ تواناو ئـەزموون: خـوای گـەورە دەفـەرموویێت[3]: ﴿ قَالَ اجْعَلْنِي عَلَى خَزَآئِنِ الأَرْضِ إِنِّي حَفِيظٌ عَلِيمٌ ﴾.

لەفەرموودەشـدا هـاتووە كـە دەشـتەكییە هاتۆتـە خزمـەتی و وتوویەتی[4]: ((مَتَى السَّاعَةُ؟ فَمَضَى رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يُحَدِّثُ، فَقَالَ بَعْضُ الْقَوْمِ: سَمِعَ مَا قَالَ فَكَرِهَ مَا قَالَ. وَقَالَ بَعْضُهُمْ: بَلْ لَمْ يَسْمَعْ، حَتَّى إِذَا قَضَى حَدِيثَهُ قَالَ: «أَيْنَ – أُرَاهُ – السَّائِلُ عَنِ السَّاعَةِ» قَالَ: هَا أَنَا

---

[1] صحيح مسلم ٤ / ١٩٨٧ ( ٢٥٦٤ ).

[2] سورة الأنبياء ؛ آية ٧٩ ـ ٨١.

[3] سورة يوسف ؛ آية ٥٥.

[4] صحيح البخاري ١ / ٢١ ( ٥٩ ).

يَا رَسُولَ اللَّهِ، قَالَ: «فَإِذَا ضُيِّعَتِ الأَمَانَةُ فَانْتَظِرِ السَّاعَةَ»، قَالَ: كَيْفَ إِضَاعَتُهَا؟ قَالَ: «إِذَا وُسِّدَ الأَمْرُ إِلَى غَيْرِ أَهْلِهِ فَانْتَظِرِ السَّاعَةَ»)). واتە: کەی رۆژی قیامەت دێت؟ پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) بەردەوام بوو لەسەر قسەکردن، هەندێک لەخەڵکەکە وتیان: ئەوەی وتی گوییان لێ بوو ئەوەی وترا پێی خۆش نەبوو، هەندێکیش وتیان: بەڵکو گوێی لێ نەبوو، هەتا قسەکانی تەواوبوون فەرمووی: ((کوا – بابیبینم- ئەوکەسەی پرسیاری لەبارەی رۆژی دواییەوە کرد))، وتی: ئەوەتام ئەی پێغەمبەری خوا، فەرمووی: ئەو کاتەی سپاردە بەزایە درا، وتی: چۆن بەزایە دەدرێت؟ فەرمووی: ئەگەر کار درایە دەست کەسانیک شایانی نەبن.

٩ـ سنگفراوانی و دەروونباشی بەرانبەر کەسانی تر: هاونیشتمانی چاک، هاونیشتمانیەکە سنگفراوانە بەرانبەر کەسانی ترو، ئارام بگرێت لەسەر ئازاریان و، رق وکینە بەرانبەر هیچ دروستکراوێکی خوا لەدلیدا هەڵنەگرێت، ساناو نەرم ونیان ولێبوردە بێت، خوای گەورە دەفەرموویت[١]: ﴿وَعِبَادُ الرَّحْمَنِ الَّذِينَ يَمْشُونَ عَلَى الأَرْضِ هَوْنًا وَإِذَا خَاطَبَهُمُ الْجَاهِلُونَ قَالُوا سَلامًا﴾.

لەفەرموودەشدا هاتووە[٢]: «أَلا أُخْبِرُكُمْ بِمَنْ تُحَرَّمُ عَلَيْهِ النَّارُ؟ عَلَى كُلِّ هَيِّنٍ لَيِّنٍ قَرِيبٍ سَهْلٍ»، واتە: ئایا هەواڵتان بدەمێ ئاگر لەسەر کێ حەرام کراوە؟ لەسەر هەموو نەر ونیانێکی نزیکی ئاسان.

---

[١] سورة الفرقان ؛آية ٦٣.

[٢] أبو حاتم البُستي: محمد بن حبان بن أحمد بن حبان (ت ٣٥٤هـ) الإحسان في تقريب صحيح ابن حبان، ترتيب: الأمير علاء الدين علي بن بلبان الفارسي (ت ٧٣٩ هـ)حققه وخرج أحاديثه وعلق عليه: شعيب الأرنؤوط،ط١، الناشر: مؤسسة الرسالة، بيروت، ١٤٠٨ هـ – ١٩٨٨ م، ٢ / ٢١٦ ( ٤٧٠).

## بناغەو پایەکانی پەیوەندی نێوان ڕۆڵەکانی یەك نیشتمان و کەسانی تر لەشەریعەتدا:

ئیسلام بناغەی بنەما مەزنەکانی لەپێناوی پێکەوەژیانی ئاشتیانەو یەکخستنی هەوڵەکان و بەدیهێنانی دادپەروەری ویەکسانی و پەیوەستی نێوان ڕۆڵەکانی یەک کۆمەڵگاو نیشتمان دامەزراندووە، بەڵکو لەگەڵ هەموو گەلانی سەر زەویدا، ئەم بنەمایانەش گرەنتییە بۆ ئەوەی هەمووان لەسایەیدا بەئاشتەوایی بژین، هەموو مافە ئاینیی و تایبەتمەندییەکانیان بۆ دەستەبەر بکرێت، مافیان هەیەو ئەرکیان لەسەر شانە بەبێ جیاوازی یان پێشێلکردنی مافێک لەمافەکان، لەو بنەما مەزنانەش:

١- هەموو مرۆڤایەتی پەروەردگارو دروستکاریان یەکە: ﴿الْحَمْدُ للَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ﴾[1]. بنچینەیان یەکە: ﴿ يَا أَيُّهَا النَّاسُ اتَّقُواْ رَبَّكُمُ الَّذِي خَلَقَكُم مِّن نَّفْسٍ وَاحِدَةٍ وَخَلَقَ مِنْهَا زَوْجَهَا وَبَثَّ مِنْهُمَا رِجَالاً كَثِيرًا وَنِسَاء وَاتَّقُواْ اللَّهَ الَّذِي تَسَاءلُونَ بِهِ وَالأَرْحَامَ إِنَّ اللَّهَ كَانَ عَلَيْكُمْ رَقِيبًا﴾[2].

لەفەرموودەشدا هاتووە[3]: «يَا أَيُّهَا النَّاسُ، أَلَا إِنَّ رَبَّكُمْ وَاحِدٌ، وَإِنَّ أَبَاكُمْ وَاحِدٌ، أَلَا لَا فَضْلَ لِعَرَبِيٍّ عَلَى عَجَمِيٍّ، وَلَا لِعَجَمِيٍّ عَلَى عَرَبِيٍّ، وَلَا أَحْمَرَ عَلَى أَسْوَدَ، وَلَا أَسْوَدَ عَلَى أَحْمَرَ، إِلَّا بِالتَّقْوَى أَبَلَّغْتُ»، قَالُوا: بَلَّغَ رَسُولُ اللَّهِ، ثُمَّ قَالَ: «أَيُّ يَوْمٍ هَذَا؟»، قَالُوا: يَوْمٌ حَرَامٌ، ثُمَّ قَالَ: «أَيُّ شَهْرٍ

---

[1] سورة الفاتحة ؛ آية ٢.

[2] سورة النساء ؛ آية ١.

[3] مسند الإمام أحمد ٣٨ / ٤٧٤ (٢٣٤٨٩).

هَذَا؟»، قَالُوا: شَهْرٌ حَرَامٌ، قَالَ: ثُمَّ قَالَ: «أَيُّ بَلَدٍ هَذَا؟»، قَالُوا بَلَدٌ حَرَامٌ، قَالَ: «فَإِنَّ اللَّهَ قَدْ حَرَّمَ بَيْنَكُمْ دِمَاءَكُمْ وَأَمْوَالَكُمْ» . قَالَ: وَلَا أَدْرِي قَالَ: أَوْ أَعْرَاضَكُمْ، أَمْ لَا  ـ كَحُرْمَةِ يَوْمِكُمْ هَذَا، فِي شَهْرِكُمْ هَذَا، فِي بَلَدِكُمْ هَذَا أَبَلَّغْتُ "، قَالُوا: بَلَّغَ رَسُولُ اللَّهِ، قَالَ: «لِيُبَلِّغِ الشَّاهِدُ الْغَائِبَ». واته: ((ئەی خەڵکینە، پەروەردگارتان یەکێکە، باوکتان یەکە، عەرەب هیچ باشەیەکیان بەسەر عەجەم و ڕەش بەسەر سوورو سوور بەسەر ڕەشدا نیە، بەتەقوا نەبێت، ئایا گەیاندم، وتیان: پێغەمبەری خوا گەیاندی، پاشان فەرمووی: ئایا ئێوە ئەزانن لە چ مانگێک و لە چ ڕۆژێک و لە چ شارێکدان؟ وتیان: بەڵێ لە ڕۆژو شارو مانگی حەرامداین، فەرمووی: کەواتە بزانن خوێنتان و ماڵتان و خۆتان لە یەکتری حەرامە، وەک حەرامێتی ئەم ڕۆژەتان لەم مانگەتاناو لەم شارەتانا ئایا رامگەیاند، وتیان: پێغەمبەری خوا ڕایگەیاند، فەرموی: با ئەوەی لێرە ئامادەبووە بیگەیەنێت بەوەی لێرە نەبووە)).

٢ـ برایەتی: ئیسلام برایەتی کردووە بەچەند پلەیەک:

ـ برایەتی ڕەچەڵەک: ﴿ وَأُوْلُواْ الأَرْحَامِ بَعْضُهُمْ أَوْلَى بِبَعْضٍ فِي كِتَابِ اللَّهِ إِنَّ اللَّهَ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيمٌ ﴾[١].

ـ برایەتی ئاین وبیروباوەڕ: ﴿ إِنَّمَا الْمُؤْمِنُونَ إِخْوَةٌ فَأَصْلِحُوا بَيْنَ أَخَوَيْكُمْ وَاتَّقُوا اللَّهَ لَعَلَّكُمْ تُرْحَمُونَ ﴾[٢].

ـ برایەتی نیشتمانی یان نەتەوەیی: ﴿ إِذْ قَالَ لَهُمْ أَخُوهُمْ نُوحٌ أَلَا تَتَّقُونَ ﴾[١]، ﴿إِذْ قَالَ لَهُمْ أَخُوهُمْ لُوطٌ أَلَا تَتَّقُونَ ﴾[٢].

---

[١]سورة الأنفال ؛ آية ٧٥.

[٢] سورة الحجرات ؛ آية ١٠.

ـ برایـەتی مرۆڤایـەتی: ﴿ يَا أَيُّهَا النَّاسُ إِنَّا خَلَقْنَاكُم مِّن ذَكَرٍ وَأُنثَى وَجَعَلْنَاكُمْ شُعُوبًا وَقَبَائِلَ لِتَعَارَفُوا إِنَّ أَكْرَمَكُمْ عِندَ اللَّهِ أَتْقَاكُمْ إِنَّ اللَّهَ عَلِيمٌ خَبِيرٌ ﴾[3].

لەفەرموودەشدا هاتووە[4]: « أَنَا شَهِيدٌ أَنَّ الْعِبَادَ كُلَّهُمْ إِخْوَةٌ ». واتە: من شاهیدم کە هەموو بەندەکان بران.

لەسایەو ئامێزی ئەم برایەتیەی کۆتاییاندا (مرۆڤایەتی) موسڵمانان و پێکهاتـەکانی تـری شارسـتانێتی ئیسـلامی بـەدرێژایی مێـژوو، بـە ئاشـتەوایی و ڕێزلێگیراوانـەو سـەربەرزانەو، یەکسـان لەمافەکانـدا پێکەوە ژیاون، ئەوەش بەبەڵگەنامەو شاهێدی ڕوون دەکەینەوە.

٣- پیکـەوەژیان بـەلێبوردەیی و ئاشـتی لـەنێوان ئادەمیزادەکانـدا ئیدی ئـەو مرۆڤانـە هـەرکێ بن، بـەبێ سـەیرکردنی ئـاین و تائیفـەیان، بەومەرجەی شەڕکار (محارب) یاخود ستەمکار یان دەستدرێژیکار بۆ سـەر کەسـانی تـرو بـۆ سـەر مافـەکانیان نـەبێت، خـوای گـەورە دەفـەرموویت[5]: ﴿ لا يَنْهَاكُمُ اللَّهُ عَنِ الَّذِينَ لَمْ يُقَاتِلُوكُمْ فِي الدِّينِ وَلَمْ يُخْرِجُوكُم مِّن دِيَارِكُمْ أَن تَبَرُّوهُمْ وَتُقْسِطُوا إِلَيْهِمْ إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ الْمُقْسِطِينَ (٨) إِنَّمَا يَنْهَاكُمُ اللَّهُ عَنِ الَّذِينَ قَاتَلُوكُمْ فِي الدِّينِ وَأَخْرَجُوكُم مِّن دِيَارِكُمْ

---

[1] سورة الشعراء ؛ آية ١٠٦.

[2] سورة الشعراء؛ آية ١٦١.

[3] سورة الحجرات ؛ آية ١٣.

[4] ابن حنبل: أبو عبد الله أحمد بن محمد بن حنبل (ت ٢٤١هـ)مسند الإمام أحمد بن حنبل،المحقق: شعيب الأرنؤوط – عادل مرشد، إشراف: د عبد الله بن عبد المحسن التركي وآخرون،ط١،الناشر: مؤسسة الرسالة، ١٤٢١ هـ – ٢٠٠١ م، ٣٢ / ٤٩ (١٩٢٩٣).

[5] سورة الممتحنة ؛ آية ٨ . ٩.

وَظَاهَرُوا عَلَى إِخْرَاجِكُمْ أَن تَوَلَّوْهُمْ وَمَن يَتَوَلَّهُمْ فَأُوْلَئِكَ هُمُ الظَّالِمُونَ (٩) .

٤- بەگژداچوونـــەوەی ڕەگەزپەرســـتی بەهـــەموو چەشـــنەکانی، ڕەگەزپەرستی نەتەوەیی، یاخود هۆزایەتی، یان خێزانی، یا ئاینی، یان تـائیفی، یـاخود جگـە لـەوان، ئەمـەش لـەپێناو ئامادەسـازی ژینگەیـەکی تەندروســتی چــاک دوور لەدژایــەتی و پیلانگێــڕی و ڕق لەیــەکبوون لەوانەی کە لەسەر خاکەکەی دەژین.

پێغەمبەر(ρ) دەفەرموویێت[1] :«لَيْسَ مِنَّا مَنْ دَعَا إِلَى عَصَبِيَّةٍ، وَلَيْسَ مِنَّا مَنْ قَاتَلَ عَلَى عَصَبِيَّةٍ، وَلَيْسَ مِنَّا مَنْ مَاتَ عَلَى عَصَبِيَّةٍ». واتە: لەئێمـە نیـە هەرکـەس بانگەشـەی دەمـارگیری بکـات، لەئێمـە نیـە هەرکـەس لەسـەر رەگەزپەرستی بجەنگێت، لەئێمـە نیـە هەرکـەس لەسـەر رەگەزپەرسـتی بمرێت.

کـاتێ یـەکێک لـەهاوەڵانی برایـەکی بـەپێی بنەچـەو ڕەگـەزی پێوانـە کــرد، گوتــە بەناوبانگەکــەی فــەرموو، لەمــەعرورەوە گێڕاویانەتــەوە وتوویـەتی[2]: لـەڕەبەزە بـەلای ئـەبو زەڕدا تێپـەڕین، پشـتەماڵە (عـەبای عـەرەبی) لەبـەردا بـوو، خزمەتکارەکەشـی یـەکیکی وەک ئـەوەی ئەوی لەبەردا بوو، وتمان: ئەگەر هەردووکیانت پێکەوە کۆبکردایەتەوە ئەوا دەبووە ئاوریشم، وتی: قسەیەک کەوتە نێوان من و برایەکم، کەدایکی ئەو ئەعجەمی بوو، منیش بەدایکی قسەم پێ وت، لای پێغەمبەر (صلی

[1] سنن أبي داود ٧ / ٤٤١ (٥١٢١).

[2] النيسابوري: مسلم بن الحجاج أبو الحسن القشيري (ت ٢٦١هـ)صحيح مسلم (المسند الصحيح المختصر بنقل العدل عن العدل إلى رسول الله صلى الله عليه وسلم )المحقق: محمد فؤاد عبد الباقي، الناشر: دار إحياء التراث العربي – بيروت، ٣ / ١٢٨٢ (١٦٦١).

الله عليه وسلم) سكالأى لەدژ كردم، كاتێ گەیشتمە خزمەت پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی: « يَا أَبَا ذَرٍّ، إِنَّكَ امْرُؤٌ فِيكَ جَاهِلِيَّةٌ»، واتە: ئەی ئەبو زەڕ تۆ پیاوێكی خەسڵەتی سەردەمی نەفامیت تیدا ماوە.

٥- دادپەروەری ویەكسانی لەنێوان خەڵكیدا:

لەگرنگترین بنەما ئیسلامییە مەزنەكانە، جیبەجێكردنی كرداریی چەمكی دادپەروەری ویەكسانی لەكۆمەلگادا بەبێ سەرنجدانی ئاین یاخود ڕەچەڵەك یان ڕەنگ یان شار، هەمووان لەبەردەم دادپەروەری ئیسلامدا یەكسانن و، قورئانی پیرۆز وفەرموودەكانی پێغەمبەرو مێژوو ئیسلامی پڕن لەدەقی تیۆری و كرداریی لەمبارەیەوە.

خوای گەورە دەفەرمووێت[١]:﴿ إِنَّ اللَّهَ يَأْمُرُ بِالْعَدْلِ وَالإِحْسَانِ وَإِيتَاء ذِي الْقُرْبَى وَيَنْهَى عَنِ الْفَحْشَاء وَالْمُنكَرِ وَالْبَغْيِ يَعِظُكُمْ لَعَلَّكُمْ تَذَكَّرُونَ﴾.

لە فەرموودەیەكیشدا هاتووە[٢]: لەعائیشەوە (خوا لێی رازی بێت) دەگێڕنەوە كە قوڕەیشیەكان مەسەلەی دزیكردنی ئافرەتە مەخزومیەكەیان بەگرنگ وەرگرتبوو، وتیان: باشە كێ لەبارەیەوە قسە لەگەڵ پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) بكات؟ وتیان: كێ بوێری ئەوە دەكات جگە لەئوسامەی كوڕی زەید، كەخۆشەویستی پێغەمبەری خوایە (صلى الله عليه وسلم)، ئوسامە قسەی لەگەڵ كرد، پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی: « أَتَشْفَعُ فِي حَدٍّ مِنْ حُدُودِ اللَّهِ، ثُمَّ قَامَ فَاخْتَطَبَ، ثُمَّ قَالَ: إِنَّمَا أَهْلَكَ الَّذِينَ قَبْلَكُمْ، أَنَّهُمْ كَانُوا إِذَا سَرَقَ فِيهِمُ الشَّرِيفُ تَرَكُوهُ، وَإِذَا سَرَقَ فِيهِمُ الضَّعِيفُ أَقَامُوا عَلَيْهِ الحَدَّ،

---

[١] سورة النحل ؛ آية ٩٠.

[٢] صحيح البخاري ٤ / ١٧٥ (٣٤٧٥).

وَايْمُ اللَّهِ لَوْ أَنَّ فَاطِمَةَ بِنْتَ مُحَمَّدٍ سَرَقَتْ لَقَطَعْتُ يَدَهَا »، واتــە: ئایــا لەسنووریک لە سنوورەکانی خوادا تکا دەکەیت، ئەوانەی پێش ئێوە بــەوە تیــاچوون، ئەگــەر کەســێکی شــەریفیان دزی بکرایــە وازیــان لێدەهێنا، خۆ ئەگــەر کەسێکی لاوازیــان دزی بکردایــە ئــەوا حــەدیان لەسەر جێبەجێ دەکرد، سوێند بەخوا ئەگەر فاتیمەی کچی محەمەد دزی بکات دەستی دەبڕم.

لــەمێژووی ئیسلامیشــدا: عومــەر بــۆ ئــەبو موســای نووســی[1]:

((پاشــان: قەزا فەرزێکــی جێگیــرە و نەگــۆڕە و ســوننەتێکی شــوێنپێ هەڵگیراوە، گەر رووی تێکردی تێیبگە، قسەکردن بە حەق سوودێکی نیــیە گەر جێبەجــێ کردنــی بــۆ نەکرێــت، لەگەڵ ئەهلــی مەجلــیس و رووپێدان و قەزاوەتت یەکسان مامەڵە بکە (یان بیانکە بە نموونەی یەکتر) تا خاوەن دەسەلات تەماع نەکاتە ستەمی تۆ و لاوازیش لە دادپەروەریت بێهیوا نەبێت، بەڵگە لەســەر ئەو کەســەیە داوایەکی هەیە و ســوێندیش لەســەر ئەو کەســەیە نکــوڵی دەکــات، ســوڵح دروســتە لەنێــوان موســڵماناندا، مەگەر ســوڵحێک حەرامێــک حەڵاڵ بکــات یــان حەڵاڵێــک حەرام بکــات، هەر کەس بانگەشــەی مــافێکی نائامــادە یــان بەڵگەیەکی نائامادەی کرد کاتێکی بۆ دیاری بکە تیایدا کۆتایی پێ بهێنێت، گەر بە بەڵگە سەلماندی مافی خۆی پێ بدە، گەر دەستەوسان بــوو لە هێنــانی بەڵــگە پرســەکە بەڕوویــدا بشــکێنەوە، ئەوە باشــترین پاســاوە بۆ شــتی نــاڕوون، ئەو قەزاوەتەی ئەمڕۆ کــردووتە و پاشــان لێــی پاشــگەز بــوویتەوە و بڕیــاری دروســتت دۆزیەوە رێگریــت لــێ

---

[1]ابن قيم الجوزية: محمد بن أبي بكر بن أيوب بن سعد (ت ٧٥١هـ)إعلام الموقعين عن رب العالمين،تحقيق: محمد عبد السلام إبراهيم،ط١،الناشر: دار الكتب العلمية – بيروت، ١٤١١هـ – ١٩٩١م، ١ / ٦٨.

نەکات پێداچوونەوەی ئەو حەقە بکەیت، حەق کۆنە و هیچ شتێک پووچی ناکاتەوە، گەڕانەوە بۆ حەق باشترە لە پێڕاکێشان لە باتڵدا، موسڵمانان هەندێکیان لەسەر هەندێکیان خاوەن دادگەرن، مەگەر کەسێک شایەتی درۆی لێ ئەزموون کرابێت یان جەڵدکرابێت بە تاوانێک یان جێگەی گومان بێت لە پێدانی مەیل و خۆشەویستی و خزمایەتی، خودا نهێنی بەندەکانی گرتۆتە دەست و گوناهەکانی بۆ پۆشیون مەگەر بە بەڵگەی رۆشن و سوێنخواردن، پاشان تێگەیشتن، تێگەیشتن بۆ ئەو شتەی رووت لێ دەکات لەوەی لە قورئان و سوننەتدا نییە، ئەوجا کارەکان بەوە پێوانە بکە، نموونەکان بزانە و پاشان کامەیان لەلای خودا خۆشەویستترە و لە حەقەوە نزیکترە پارسەنگی بکە، ئاگادارت دەکەمەوە لە تووڕەبوون و نیگەرانی و دڵەڕاوکێ و وەڕسی و ئازارخواردن بە خەڵکی و خۆگۆڕین و دانپیادانەنانی خەڵکی لەکاتی نەیاری و رکەبەری یەکدیدا چونکە قەزا لە شوێنی حەقی خۆیدا و لەو شتانەی خودا پێویستی کردووە پاداشتی لەسەرە و ناوی باشی پێ بەدەست دێت، هەر کەس لە حەقدا نییەتی پاڵفتە بکات با لەسەر نەفسی خودی خۆشی بێت خودا ئەوەی لە نێوان ئەو و خەڵکیدایە دەگرێتە ئەستۆی خۆی، هەر کەس خۆی بڕازێنێتەوە بە شتێک کە لە ناخیدا بوونی نییە خودا ناشیرینی دەکات، خودا تەنها کار و کردەوەی پاڵفتە لە خەڵکی قبووڵ دەکات، دەبێ گومانت چی بێت بە پاداشتێک لەلای خودا لە رۆزییەکی خێرا و گەنجینەی رەحمەتی، والسلام علیک ورحمە الله)).

ئیبن قەیم قسە لەسەر قسەکانی عومەر (τ) دەکات ودەڵێت[1]: ئەمە نامەیەکی بەرزە زانایان قبوڵیان کردووەو بنچینەکانی حوکم و

---

[1]هەمان سەرچاوەو هەمان بەرگ ولاپەڕە.

شاهیدیدانیان لەسەر بونیات ناوە، حاکم و موفتی لەهەمووان پتر پێویستیان بەبۆچوونەکان و تێگەیشتن لێی هەیە.

٦- بەزەیی هاتنەوە بەیەکدا لەنیوا ئادەمیزادەکاندا: ئەم بنەمایەش بەهەمان شیوە لەبنەما مەزنەکانی ئیسلامە، یەکێک لەناوە بەرزەکانی خوای گەورەیە[1]: (الرحمن، الرحيم) ئەو میهرەبانییەی خوای گەورە فەرمانی پێکردووە گشتگیرەو هەموو گیانلەبەرانی سەر زەوی دەگرێتەوە بەمرۆڤ وئاژەڵەوە.

لەفەرموودەشدا هاتووە[2]: «الرَّاحِمُونَ يَرْحَمُهُمُ الرَّحْمَنُ، ارْحَمُوا أَهْلَ الْأَرْضِ يَرْحَمْكُمْ أَهْلُ السَّمَاءِ، وَالرَّحِمُ شُجْنَةٌ مِنَ الرَّحْمَنِ، مَنْ وَصَلَهَا، وَصَلَتْهُ، وَمَنْ قَطَعَهَا، بَتَّتْهُ»، واتە: خاوەن بەزەییەکان خوا بەزەیی دێتەوە پێیاندا، بەزەیتان بێتەوە بەخەڵکی سەرزەویدا ئەهلی ئاسمانەکان بەزەییان دێتەوە پێتاندا، بەزەیش لەپەروەردگارەوەیە، هەرکەس بەجێی بگەیەنێت، ئەوا پێی دەگات، هەرکەسیش بیپچڕێنێت ئەوا لێی دەبڕدرێت.

٧- دانپێدانان بەهەمەچەشنەیی و فرەیی ئاینی و ڕەچەڵەکی و رۆشنبیریی و سیاسیی و جگە لەوانەش: ﴿ يَا أَيُّهَا النَّاسُ إِنَّا خَلَقْنَاكُم مِّن ذَكَرٍ وَأُنثَى وَجَعَلْنَاكُمْ شُعُوبًا وَقَبَائِلَ لِتَعَارَفُوا ﴾[3].

هەرکەس سەرنجی دامەزراندنی یەکەم دەوڵەت لەئیسلامدا و دەستووری مەدینە بدات بەڕوونی دەبینێت کەبونیاتنانی ئەو دەوڵەتە لەڕووی ماف وئەرکەکانەوە بۆ هەموو هاونیشتمانیانی لەسەر بناغەی

---

[1] سورة الفاتحة ؛ آية ٢.

[2] مسند الإمام أحمد ١١ / ٣٣ (٦٤٩٤ ) وسنده صحيح .

[3] سورة الحجرات ؛ آية ١٣.

هاونیشتمانیبوون بووه نەک لەسەر بنەمای ئاین یان ڕەچەڵەک و جگە لەوانە ئیدی موسڵمان بووبن یان پەیڕەوانی ئاینی تر، یاخود بێباوەڕ، ئـەم دەسـتووره هـەروەک دواتـر باسـی دەکـەین لەلایـەن پێغەمبـەری ئومەتەوه (ρ)[1] ئامادە کراوه.

مامۆستا مونیر بەیاتی قسە لەسەر دەستووری مەدینە دەکات کە پێغەمبـەری ئیسـلام (ρ) داینـاوەو دەڵێـت[2]: ((ئەمـەش بـووه یەکـەم ڕێکخستنی کاروبـاری دەوڵـەتی مەدینـەو ئـەو بەڵگەنامـە یـان جاڕنامـە دەستووره توانی مەدینە کە چەندین شوینی جیاوازی تێدا بوو... بکاتە شارێکی یەکگرتوو))، پێشـەوا ئەبو زوهـرەش دەڵێت[3]: ((ئیسـلام ڕێزی کەسـێتی مـرۆڤ دەگرێـت، کەسـێتی مـرۆڤیش تـەنها لەگـەڵ ئازادیـدا بـوونی دەبێـت، ئـازادی نیشـتەجێبوون، ئـازادی هـاتوچۆ، ئـازادی ئاینداری، ئازادی فیکرو بۆچوون و، ئازادی دەوڵەت)).

---

[1] الحميري ابن هشام:محمد بن عبد الملك ( ت ٢١٣هـ ) السيرة النبوية، تحقيق: طه عبد الرؤوف، ط١، بيروت ـ دار الجيل ١٤١١ هـ، ٣ / ٣١.

[2] البياتي: منير حميد، الدولة القانونية والنظام السياسي الإسلامي، ط١، الدار العربية للطباعة ـ بغداد، ١٣٩٩ هـ / ١٩٧٩م، ص٧٣.

[3] أبو زهرة:محمد بن أحمد بن مصطفى بن أحمد المعروف بأبي زهرة (ت ١٣٩٤هـ)المجتمع الإنساني في ظل الإسلام، الدار السعودية للنشر و التوزيع ص ٢٥٧.

## لەدەرئەنجام و شوینەوارە ئەرێنیەکانی هاونیشتمانیبوون:

بڵاوکردنەوەی رۆشنبیری برایەتی وپێکەوەگونجان و هاریکاری و سەرخستنی یەکترو هاوپشتی لەنێوان هاونیشتمانیانی یەک وڵات و یەک نیشتماندا، تا بەرەو بونیاتنانی دەوڵەتێکی فرەیی بنکە فراوانی گەشەسەندووی شارستانی گونجاو لەگەڵ رۆحی سەردەم و هەرەشەکانیدا.

دەوڵەتی هاونیشتمانیبوونی ڕاستەقینە سەرچاوەکانی کێشە ئاینی و ڕەچەڵەکییەکان و، بەرەوڕووبونەوەی لەناوبردنی بەکۆمەڵ و، ولانان و پەراوێزخستنی خەڵکی وڵات ناهێڵێت و[1]، ناسنامە جیاوازەکان قبوڵ دەکات و رێزی هەمووان دەگرێت، هاونیشتمانیبوونی ڕاستەقینە دێنێتە دی، ئەمەش ئاسایش و سەقامیگریی و گەشەکردن و پێشکەوتنی وڵات دابین دەکات.

وشککردنی سەرچاوەکانی تیرۆرو توندڕەوی، چونکە ئەو فشارانەی لەسەر زۆرێک لەهاونیشتمانیان ئەنجام دەدرێت، ئیدی موسڵمان بن یان لەپێکهاتەکانی تر بەهۆی پەراوێزخران و وەلانان و بەشداری پێنەکردنیان لەژیانی گشتیداو، هەندێک هەموو خێرو بێری ببات وزۆرینە فەرامۆش بکرێت، پاشان دەستەیەک یان چینێکی فراوان لەکۆمەڵگا بێکار یاخود بێ پۆست، یان بێبەش لەبەشداری کرداریی بکرێت و، هەژاری ونەخۆشی بڵاو ببێتەوەو، هاووڵاتی

---

[1] **بڕوانە:** الفوزان: د. عبد الله محمد، المواطنة والتحديات المعاصرة، صحيفة عكاظ ( ٦ / ٣ / ٢٠٠٨ م ) العدد ٢٤٥٤.

هەست بەبێئومێدی لەژیاندا بکات دەبێتە هۆیەک لەهۆیەکانی بوونی لایەنگیری بۆ تیرۆرو توندڕەوی پەرتەوازەیی و جیابوونەوە!.

هەستکردن بەهاونیشتمانیبوونی ڕاستەقینەو ئازادی ویەکسانی، پاڵ بەخاوەنەکەیەوە دەنێت بۆ کارابوونی ئەرێنی لەگەڵ نیشتمان و کۆمەڵگاکەیدا، پێشکەشکردنی کار بەڕەزامەندی و دڵسۆزی و قەناعەتەوە، هەروەک چۆن وای لێدەکات هەست بەبوون وکیانی خۆی بکات.

ڕێگریکردن لە بڵاوبوونەوەی ئاژاوەگێڕی و، گەڕانەوە بۆ مەرجەعیەتە دەستووری ویاسایی وشەرعییەکان، چونکە ئەوەی زیاتر دەبێتە هۆی ئاڵۆزی و ئاژاوەگێڕی لەکۆمەلگادا بریتییە لەستەم و بەشخورانی کەسانی ترو، دەستدرێژی و خۆبەگەورە زانین بەسەریاندا و، جیاکاریی ڕەگەزپەرستی یان ئاینی، یاخود تائیفی لەدژیان.

# دەروازەی دووەم:

## ئیسلام و جێبەجێکردنی کرداریی بنچینەکانی هاونیشتمانیبوون لەفیقهو شارستانێتی ئیسلامیدا بە بەڵگەو شاهێدیدانی گەورە رۆژهەڵاتناسان و مێژوونووسانی رۆژئاوا.

**جیاوازی و هەمەچەشنەیی یاساکانی بوونەوەرو ژیان و زیندەوەران:**

سەپاندنی تاکە یەک ناسنامە بەسەر خەلکیدا یاخود تەنانەت بەسەر هاووڵاتیانی یەک دەوڵەتدا کارێکی تەواو ئەستەمە، یاخود جۆرێکە لەشێتی، چونکە خوای گەورە بوونەوەرو ژیان وزیندەوەرانی هەموو بەجیاوازو هەمەرەنگ دروست کردووە، بۆ ئەوەی نمونەییەکی واقیعی بۆ ئەوە بهێنینەوە کەلەئێستادا لەئارادایەو پێویست بەگەڕانەوە بۆ قوڵاییەکانی مێژوو نەکات، بەڵکو لەمێژووی هاوچەرخماندایە، وڵاتی یەکێتی سۆڤیەتی پێشوو، یۆگسلافیا کەهەردووکیان هەرەسیان هێنا، هەریەک لەو دوو وڵاتە تاکە ناسنامەیەکی بەزەبری ئاگرو ئاسن بەسەر هەموو هاووڵاتیانی ئەو ئیمپراتۆریەتە فراوانەدا سەپاندبوو، کە ئەویش: ناسنامەی بێباوەڕی و شیوعیەت بوو، بەهەمان شێوە کەمال ئەتاتۆرک هەمان هەنگاوی ئەوانی هەڵگرت و تاکە ناسنامەیەکی بەسەر گەلان و هۆزو ئاینەکانی دەوڵەتی تورکیادا لەسەدەی رابردوودا سەپاند[1]! بەڵام هەموو ئەوانە پاش چەندین ساڵ چییان بەسەرهات؟ داڕوخان، فرەیی، ڕەگەزەکان، جەنگی لەناوبەر... هتد،

---

[1] ملكاوي: فتحي حسن، فقه الانتماء إلى المجتمع والأمة،المعهد العالمي للفكر الإسلامي . فرجينيا ( الولايات المتحدة الأمريكية ) ط١، ١٤٣٢ هـ / ٢٠١٢٣م، ص ٣٤٨.

چونکه ئەوەی بوونەوەرو ژیانی دروستکردووە ئاگادارترو زاناترە!. خوای گەورە دەفەرموویێت[1]: ﴿ وَلَوْ شَاء رَبُّكَ لَجَعَلَ النَّاسَ أُمَّةً وَاحِدَةً وَلاَ يَزَالُونَ مُخْتَلِفِينَ﴾.

ئیبن عەتیە دەڵێت[2]: واتە: دەیکردنە یەک ئومەتی باوەڕدار هەتا بێباوەڕی لێیان ڕوونەدات وشتی هاوشێوەیان تووش نەبێت، بەڵام خوای گەورە ئەوەی نەویست، ئەوان هەتا ئیستاش لەئاین و بۆچوون و میللەتدا جیاوازبوون، ئەمە لێکدانەوەی کۆمەڵی زانایانە)).

ئیبن کەسیر وتوویەتی[3]: ((واتە جیاوازی خەڵکی لەئاین و بیروباوەڕو میللەت و ڕێبازو بۆچوونیاندا))).

سەید دەڵێت[4]: ((سروشتی مرۆڤ وایە جیاواز بن، چونکە ئەو جیاوازییە بنچینەیەکە لە بنچینەکانی بونیانەو داناییەکی بەرز لە جینشینێتی ئەم دروستکراوە لەسەر زەوی دێنێتە دی.. ئەم جینشینیەتە پێویستی بەئەرکی هەمەچەشن و، ئامادەیی هەموو ڕەنگە جۆراو جۆرەکان هەیە تا هەموویان تەواو ببن وبگونجێن و، ڕۆڵی

---

[1]سورة الهود ؛ آية ١١٨.

[2] ابن عطية: عبد الحق بن غالب بن عبد الرحمن بن تمام بن عطية الأندلسي (ت ٥٤٢هـ)المحرر الوجيز في تفسير الكتاب العزيز،المحقق: عبد السلام عبد الشافي محمد، ط١،الناشر:دار الكتب العلمية – بيروت، ١٤٢٢ هـ، ٣ / ٢١٥.

[3] ابن كثير: إسماعيل بن عمر بن كثير القرشي (ت ٧٧٤هـ) تفسير القرآن العظيم (ابن كثير)المحقق: محمد حسين شمس الدين،ط١، الناشر: دار الكتب العلمية، منشورات محمد علي بيضون – بيروت، ١٤١٩ هـ، ٤ / ٣١٠.

[4]الشاربي: سيد قطب إبراهيم حسين (ت ١٣٨٥هـ) في ظلال القرآن، ط ١٧، الناشر: دار الشروق – بيروت– القاهرة، ١٤١٢ هـ، ١ / ٢١٥.

هـەمووەکی خـۆی ببینێـت لەجێنشـینی و ئـاوەدان کردنـەوەدا، بـەپێی نەخشەسازی گشتی بڕیاربۆدراو لەعیلمی خوای گەورەدا. بۆیە دەبێت مۆڵـەت بەهەمەچەشـنەیی تواناکـان بـدرێت بـۆ ئـەوەی لەبەرانبـەر ئـەو ئەرکـە هەمەجۆرانـەدا بێـت و، پێویسـتە جیـاوازی ئامادەسـازییەکان لەبەرانبەر ئەو جیاوازیە پێویستانەدا هەبێت)).

ئەگەر ئـەم هەمەچەشنیی و فرەییە یاسـای خـوای گـەورەو نهینیـەتی لــەبوون وژیــان و زیندووانــدا، کەواتــە ناتوانرێــت بســڕێتەوە یــاخود فەرامۆش بکرێت، بەڵکو پێویستە لەبەرچاو بگیرێت و، یاساو ڕێنمایی بۆ دەربکرێت لەپێناوی پێکـەوەژیانی ئاشـتیانەو برایانـە، یـاخود نیشـتمانی و مرۆییــدا، تــا ژیــان ســەقامگیر بێــت وبــەوجۆرەی کــەخوای گــەورە ویستوویەتی بەردەوام ببێت و، چەند مەسەلەیەک لەمە دەکەوێتەوە:

**١ - ئازادی هەڵبژاردنی بیروباوەڕ یاخود ئاین:**

یەکێک لەڕێزەکانی ئیسلام و، شـەریعەتە بێگەردەکەی لـەئادەمیزاد بریتییـە لـە: ئـازادی ڕەهـا لەهـەڵبژاردنی ئـاین وبیروبـاوەڕداو، زۆر نـەکردن لـەهیچ کـەس لەدروسـتکراوان لەسـەر هـیچ بیروبـاوەڕێکی دیاریکراو، ئیدی سروشتی ئەو بیروباوەڕو ڕاستێتیەکەی هـەرچۆنێک بێـت، بـا ئـەوە ئیسـلامیش بێـت. ئـەم بنەمایـەش لەبـەرزترینی ئـەو بنەمایانەیە کە مرۆڤایەتی ئاشـنایان بـووەو لەسـەردەمی ئادەمـەوە تـا ئــەمرۆ بــەجوانی زانیــووە. ژمــارەیەکی زۆر دەقــی قورئــان و، فـەرموودەی بێگـەردی پێغەمبـەرو، جێبـەجیکرانی ڕووداوەکـانی لـە مێژووی ئیسـلامدا هەیـەو جـەخت لـەوە دەکاتـەوەو بەبـەرزی ڕوونـی دەکاتەوە، لەوانە:

خـوای گـەورە دەفـەرموویێت[1]:﴿ لاَ إِكْرَاهَ فِي الدِّينِ قَد تَّبَيَّنَ الرُّشْدُ مِنَ الْغَيِّ﴾. لەئایەتێکی تردا فەرموویەتی[2]:﴿ وَلَوْ شَاء رَبُّكَ لآمَنَ مَن فِي الأَرْضِ كُلُّهُمْ جَمِيعًا أَفَأَنتَ تُكْرِهُ النَّاسَ حَتَّى يَكُونُواْ مُؤْمِنِينَ ﴾.

پێشـەوا ئیـبن قودامـە وتوویـەتی[3]: ((لەپێغەمبـەر –صـلی اللـە علیـە وسـلم-و لـەهیچ جێنشـینێکی نـەهاتووە کـەزۆر کرابێـت لـەهیچکام لـە پەیڕەوانی ئاینی تر (ئەهلی زیمە) لەسەر موسڵمان بوون)).

ئیبن قودامە دەڵێت[4]: ئەگەر زۆر لەکەسێک کرا لەسـەر ئیسـلام کـە دروست نەبوو زۆری لێ بکرێت، وەک زمی و ئەمانـەت پێدراو، بـەوە موسڵمان بوو، ئەوا حوکمی موسڵمان بوونی ناسەلمێت، تا ئەوەی لـێ دەردەکـەوێت کەبەویسـتی خـۆی موسـڵمان بـووە، وەک ئـەوەی پـاش نـەمانی زۆرلێکردنەکـە لەسـەر موسـڵمانێتی خـۆی بمێنێتـەوە، ئەگـەر بەرلـەوە مـرد، ئـەوا هـەمان حـوکمی بێبـاوەڕانی دەبێـت، خـۆ ئەگـەر گەڕایـەوە بـۆ سـەر ئـاینی بێبـاوەڕی، ئـەوا کوشـتن وزۆرلێکردنـی بـۆ

---

[1] سورة البقرة ؛ آية ٢٥٦.

[2] سورة يونس ؛ آية ٩٩.

[3] ابن قدامة المقدسي: موفق الدين عبد الله بن أحمد بن محمد بن قدامة الجماعيلي (ت ٦٢٠هـ) المغني لابن قدامة،الناشر: مكتبة القاهرة ٬ ١٣٨٨هـ – ١٩٦٨م، ٩ / ١٩، الزركشي: شمس الدين أبي عبد الله محمد بن عبد الله ( ت ٧٧٢هـ )شرح الزركشي على مختصر الخرقي، تحقيق قدم له ووضع حواشيه: عبد المنعم خليل إبراهيم، الناشر دار الكتب العلمية . بيروت، ١٤٢٣هـ – ٢٠٠٢م، ٣ / ٩٥.

[4] ابن قدامة المقدسي: المصدر نفسه، ٩ / ٢٣ (٧١١٥ ) ابن قدامة المقدسي: عبد الرحمن بن محمد بن أحمد بن قدامة المقدسي الجماعيلي (ت ٦٨٢هـ) الشرح الكبير على متن المقنع، أشرف على طباعته: محمد رشيد رضا صاحب المنار،الناشر: دار الكتاب العربي للنشر والتوزيع ١٠ / ١٠٧، وينظر كذلك الحفناوي:منصور محمد منصور،الشبهات وأثرها في العقوبة الجنائية في الفقه الإسلامي مقارنا بالقانون،ط١،الناشر: مطبعة الأمانة، ١٤٠٦هـ– ١٩٨٦م، ص ٦٦٥.

موسڵمان بوونەوە دروست نیە، ئەبو حەنیفەو شافیعی وایان وتووەو.. ئەهلی عیلم کۆدەنگن لەسەر ئەوەی کە زمی-ئەگەر لەسەر ئەوەی پەیمانی داوە مایەوە- ئەمانەتپێدراویش دروست نیە پەیمانەکەی پێشێل بکرێت و، دروست نیە لەسەر شتێ کە پێیەوە پابەند نەکراوە زۆری لێ بکرێت)).

زانای پایەبەرز ئەبو زوهرە دەڵێت[1] : ((ئیسلام ئاینی ئازادی کەسیی و، ئازادی هزریی و، ئازادی ئاینییە.. ئیسلام ڕێگری دەکات لەزۆرلێکردن لەسەر ئاین و، هەموو مرۆڤەکان وا لێدەکات لەسایەی خۆشەویستی و سۆزو میهرەبانی مرۆیی گشتیدا وەک یەک بن)).

ئەگەر ئازادی ومافەکانی تاک لەشەریعەتدا دەستەبەر بێت، ئەوا ئازادی کۆمەڵەکان زیاتر دابینکراوە[2].

**٢- ئەرکی سەرشانی موسڵمان گەیاندنی پەیامی ئیسلامە نەك زیاتر:**

موسڵمانان لەم کارە تێگەیشتوون و لێی بەئاگابوون و، زانیوویانە کە هیدایەت بەدەستی خوای گەورەیە، نەک بەدەستی ئەمان، بگرە ئەرکی ئاینییان لە بانگەوازی خەڵک بۆلای خودا خۆی دەبینێتەوە، پاشان مافی سەرپشکییان پێ بدرێت، لەبەر ئەوە هیچ دروستکراوێکیان ناچار نەکردووە یاخود زۆریان لێ نەکردوون لەسەر ئاین و بیروباوەڕیان، بگرە تەواوی ئازادی بیروباوەڕو بەجێگەیاندنی دروشمە پەرستشیەکانیان پێداون، ئەمەش لەڕوانگەی بنەما شەرعییە پەروەردگارییەکانەوە بووە کەشەریعەتەکەیان فەرمانی پێکردوون.

---

[1] المجتمع الإنساني في ظل الإسلام ص ١٨.

[2] **بڕوانە:** أبو زهرة، المصدر نفسه ص ٢٨٠.

خوای گەورە دەفەرموویت[1]:﴿ فَإِنْ أَسْلَمُواْ فَقَدِ اهْتَدَواْ وَّإِن تَوَلَّوْاْ فَإِنَّمَا عَلَيْكَ الْبَلاَغُ وَاللَّهُ بَصِيرٌ بِالْعِبَادِ (٢٠) ﴾.

لەئایەتێکی تردا دەفەرموویت[2]:﴿ وَمَا عَلَيْنَا إِلاَّ الْبَلاَغُ الْمُبِينُ ﴾.

زەیدی کوری ئەسلەم لەباوکیەوە دەگێڕێتەوە وتوویەتی[3]: گوێم لێبوو عومەری کوڕی خەتتاب بەپیرەژنێکی گاوری دەوت: ئەی پیرەژن موسڵمان ببە سەلامەت دەبیت، خوای گەورە محەمەدی بەحەق ڕەوانە کردووە، پیرەژنەکە وتی: من پیرەژنێکی بەتەمەنم و لەمردنەوە نزیکم! عومەر وتی: خوایا شاهێدبەو ئەم ئایەتەی خویندەوە " لَا إِكْرَاهَ فِي الدِّينِ".

شەوکانی[4] لەتەفسیری ئەم ئایەتەدا دەڵێت[5]:﴿ فَإِنَّمَا عَلَيْكَ الْبَلاغُ وَعَلَيْنَا الْحِسابُ ﴾. "تەنها گەیاندنی حوکمەکانی پەیامەکەت لەسەرە، وەرگرتنەوەی وەڵامی ئەوەی گەیاندووتە لەئەستۆی تۆ نیە، لێپرسیەوەیان لای خوای گەورەیە، واتە: لێپرسینەوە لەسەر ئەو کردەوانەی ئەنجامیان داوەو بەردەوام بوون لەسەری، ئەوە لەسەر تۆ نیە، ئەمەش دڵنەوایی خوا بوو بۆ پێغەمبەرەکەی (صلى الله عليه

---

[1] سورةآل عمران؛ آية ٢٠.

[2] سورة ياسين ؛آية ١٧.

[3] القرطبي: محمد بن أحمد بن أبي بكر بن فرح الأنصاري الخزرجي (ت ٦٧١هـ)الجامع لأحكام القرآن = تفسير القرطبي، تحقيق: أحمد البردوني وإبراهيم أطفيش،ط٢، الناشر: دار الكتب المصرية – القاهرة، ١٣٨٤هـ – ١٩٦٤ م، ٣ / ٢٨٠.

[4] الشوكاني:محمد بن علي بن محمد بن عبد الله (ت ١٢٥٠هـ)فتح القدير، ط١،الناشر: دار ابن كثير، دار الكلم الطيب – دمشق، بيروت، ١٤١٤ هـ، ٣ / ١٠٧.

[5] سورة الرعد ؛ آية ٤٠.

وسلم)و هەواڵپێدانی کەئەو هەستاوە بەئەنجامدانی ئەو کارەی خوای گەورە فەرمانی پێکردووەو، جگە لەوەی لەسەر نیە".

**٣- بەئەنجامگەیانــدنی دروشــمە ئاینیــەکان و دابینکردنــی شــوێنی ئەنجامدانی، لەگەڵ دابینکردنی سەلاحیەتە ئاینی و دونیاییەکان بۆ پێکهاتەو ئاینەکانی تر:**

ئیسلام هەروەک گرنگی بەڕێزگرتنی بەئادەمیزاد هەمووی داوە، بەهەمان شێوە ڕێزگرتنی شوێنی پەرستشەکان بۆ ناموسڵمانانیش دابین دەکات، تا دروشمە ئاینیەکانیان تییدا ئەنجام بدەن و، بۆ ئەو پێکهاتانەشی لەنیشتماندا لەگەڵیدا دەژین هەموو سەلاحیەتە ئاینی و دونیاییەکان دابین دەکات، لەفەرموودەدا هاتووە:

لە عەبدوڕەحمانی کوڕی ئەبی لەیلاوە، دەڵێت[١]: سەهلی کوڕی ئەحنەف و قەیسی کوڕی سەعد لەقادسیە دانیشتبوون، جەنازەیەک بەلایاندا تێپەڕی هەستانەوە، پێیان وترا ئەوە تەرمی زمییە، وتیان: پێغەمبەر (صلی اللە علیە وسلم) جەنازەیەکی بەلادا تێپەڕکرا هەستایەوە، پێیان وت: ئەوە تەرمی جولەکەیەک بوو، فەرمووی: "باشە ئەویش نەفس نیە".

سەبارەت بەئەنجامگەیاندنی دروشمە ئاینی و سەلاحیەتە ئاینی و دونیاییەکانیان، ئیبن سەعد وتوویەتی[٢]: پێغەمبەری خوا (صلی اللە علیە وسلم) نامەی بۆ قەشە (ئەسقەف)ی بەنی حارسی کوڕی کەعب و ئەسقەفەکانی نەجران و کاهینەکانیان و، ئەوانەی شوێنکەوتەیانن و روهبانەکانیان نووسی کەئەوەی لەژێر دەستیاندا لەکەم و زۆری فرۆشتن و نوێژەکانیان و رەهبانیەتیان بۆیان هەیە، پەیمانی خواو پێغەمبەرەکەی وایە کە ئەسقەفێک لەسەر ئەسقەفێتیەکەی و، ڕاهیبێک

---

[١] صحيح البخاري ٢ / ٨٥ (١٣١٢).

[٢] ابن سعد: محمد بن سعد بن منيع الهاشمي بالولاء (ت ٢٣٠هـ) الطبقات الكبرى،المحقق: إحسان عباس، ط١،الناشر: دار صادر – بيروت، ١٩٦٨ م، ١ / ٢٦٤.

لەسەر راهیبێتیەکەی و، کاهینێک لەسەر کاهینیەتیەکەی و، هیچ مافێک لەمافەکانیان و دەسەلاتیان و ئەوەی لەسەری بوون کەئامۆژگاری و چاکسازییان پێکردووە لەسەر شانیان بووە بەبێ بارگرانی بەستەم و ستەمکاران نەگۆڕدرێت".

لەوەی کە ئەمیری باوەڕداران عومەر (ت) لەپەیمان بۆ خەڵکی[1] ئیلیا نووسی کە گاور بوون[2]: ئەمە ئەو دڵنیاییەیە کەبەندەی خوا عومەری ئەمیری باوەڕداران داویەتی ئەخەڵکی ئیلیا، دڵنیایی سەرو ماڵیان و، کڵێساو خاچەکانیان و، ئاودیرەکان و بێتاوانیان و هەموو خەڵکەکەی پێداون، کڵێساکانیان بێدەنگ ناکرێت و وێران ناکرێن و، هیچیان لێ کەم ناکرێتەوە لەدەسەلاتی کەم ناکرێتەوە، لە خاچەکەشیان، هیچ لە ماڵ و سامانیان کەم ناکرێتەوەو، لەسەر ئاینەکەیان زۆریان لێ ناکرێت، زیان بەکەسیان ناگەیەنرێت، هیچ جولەکەیەک لەئیلیا لەگەڵیان نیشتەجێ ناکرێت، لەسەر خەڵکی ئیلیاش پێویستە کەسەرانە بدەن وەک ئەوەی خەڵکی مەدائین دەیدات، لەسەریان پێویستە رۆم و دزەکانی تێدا دەربکەن"[3]. لەڕووداوەکانی مێژووی ئیسلامی وجێبەجێکرانەکانی ئەوەی پێشەوا ئەمیری

---

[1] **شاری (بيت المقدس)ە، سێ زمانی تێدایە، محمد کوڕی سهل الكاتب وتوویەتی: مانای وشەی ئیلیاء ماڵی خوایە، بڕوانە:** البكري الأندلسي: أبو عبيد عبد الله بن عبد العزيز بن محمد (٤٨٧هـ)معجم ما استعجم من أسماء البلاد والمواضع،ط٣،الناشر: عالم الكتب، بيروت، ١٤٠٣ هـ، ١ / ٢١٧.

[2] الطبري: محمد بن جرير بن يزيد بن كثير(ت ٣١٠هـ) تاريخ الطبري = تاريخ الرسل والملوك، وصلة تاريخ الطبري (صلة تاريخ الطبري لعريب بن سعد القرطبي ( ت ٣٦٩هـ) ط٢، الناشر: دار التراث – بيروت،١٣٨٧ هـ، ٣ / ٦٠٩.

[3] **بڕوانە:** ابن السكيت: أبو يوسف يعقوب بن إسحاق (ت ٢٤٤هـ) الكنز اللغوي في اللَسَن العربي،المحقق: أوغست هفنر،الناشر: مكتبة المتنبي – القاهرة، ص ٤٢(باب السين والتاء) .

بــاوەڕداران عومـــەر (ﷺ) لەگــەڵ گاورەکــان و کڵێســـای گــەورەیان ئەنجامیـدا، کـاتێ چـووە "بیـت المقـدس ڕۆشـتە کڵیسـای قمامـە و لەصەحنەکەیدا دانیشت و کاتی نـوێژ هـات و بـەباتریکی وت ئەمـەوێت نوێژ بکەم، وتی: لەجێگەکەی خۆتدا نوێژەکەت بکە، ئەو وای نـەکردو بەتـەنها لەسـەر ئـەو پلەیـە نـویژی کـرد کـە لـە دەرگـای کڵێسـاکەدا هەبوو، کاتێ لەنوێژەکەی بوویەوە بە باتریکەکەی وت: ئەگەر لەناو کڵێساکەدا نویژم بکردایە ئەوا پاش من موسڵمانان لێیان وەردەگرتن و دەیانووت: عومەر لێرەدا نوێژی کردا!.

بـۆی نووسـین کـەنویژ لەسـەر پلەکـە نـەکرێت و بـانگی لەسـەر نـەدرێت وپاشـان بەباتریکەکـەی وت: شـوینێکم پیشـان بـدە مزگـەوتی لەسەر دروست بکەم، وتـی: لەسـەر ئـەو بـەردە بیکـە کەخوای گـەورە قسـەی لەگـەڵ یـەعقوب کـردو خـۆڵێکی زۆری لەسـەر دۆزرایـەوەو بڕیاریدا لاببرێت وبەدەسـتی خـۆی بەپۆشـاکەکەی بـەرزی کـردەوەو موسـڵمانانیش وەک ئـەویان کـردو ئـاوا لایـان بـردو فـەرمانی کـرد مزگەوتەکە دروست بکرێت".

ئیسـلام تەنانـەت ماڵـەکانی ئاگرپەرستیشـی پاراسـت و، عومـەری کـوڕی عەبدولعـەزیز نامـەی بـۆ کاربەدەسـتەکانی نووسـی[1]: کنێسـت (شـــوێنی پەرستشـــی جولەکـــەکان) و بیعـــە (شـــوێنی پەرستشـــی گاورەکـان) و مـــاڵی ئـــاگر (شـــوینی پەرسشـــتی زەرەدەشـــتیەکان) نەڕوخێنن.

---

[1] تأريخ الأمم والملوك ٦ / ٥٧٢، ابن القيم الجوزية: محمد بن أبي بكر بن أيوب بن سعد (ت ٧٥١هـ) أحكام أهل الذمة،المحقق: يوسف بن أحمد البكري - شاكر بن توفيق العاروري، ط١،الناشر: رمادى للنشر - الدمام، ١٤١٨هـ - ١٩٩٧م، ٣ / ١٢٠٠.

**لەنمونەکانی لێبوردەیی موسڵمانان لەگەڵ ناموسڵمان لەوەی کەخامەی شەرعزانانی موسڵمان لەبارەی ئازادییەکان و ڕێزگرتنی تایبەمەندییەکان نووسیوویانەتەوەو تۆماریان کردووە:**

### أ. ناچار نەکردن لەسەر ئاین:

ئەگەر فەرمانڕەوایەکی ئیسلامی یەکێک لەهاوولاتیانی ناموسڵمانی ناچار کرد موسڵمان ببێت، ئەو کارەی لەڕووی شەرعیەوە بەدروست دانانرێت، کاتێ پزیشک و دانای جولەکە (موسای کوڕی مەیمون) ناچار کرا خۆی وەک موسڵمان دەربخات، هەڵهات بۆ میسرو، گەڕایەوە سەر ئاینەکەی خۆی، موسڵمانان ئەوەیان بەهەڵگەڕانەوە ئەژمار نەکرد" ئەو کەسەی زۆری لیکراوە موسڵمان ببێت ناکرێت بەموسڵمانی ڕاستەقینە دابنرێت"[1].

دکتۆر ترتون قسەی لەسەر ئەمە کردووەو وتوویەتی[2]: "ئەم دەربڕینە لێبوردەیی جوانی لەخۆ گرتووە".

### ب. لێدانی زەنگی کڵێساو دەرخستنی خاچەکان و دروشمەکانیان:

پێشەوا ئەبو یوسف وتوویەتی[3]: "بۆیان هەیە زەنگیان لەهەرکاتیکدا شەو بێت یان رۆژ کەبیانەوێت لێ بدەن، تەنها

---

[1] وِل ديو رَانت: ويليام جيمس ديو رَانت (ت ١٩٨١ م)قصة الحضارة، ترجمة: الدكتور زكي نجيب محمُود وآخرين، الناشر: دار الجيل، بيروت – لبنان، المنظمة العربية للتربية والثقافة والعلوم . تونس، ١٤٠٨ هـ – ١٩٨٨ م،١٤ / ١٢١.

[2] السقار: منقذ بن محمود، التعايش مع غير المسلمين في المجتمع المسلم،ط١،الناشر: رابطة العالم الإسلامي – مكة المكرمة، ١٤٢٧ هـ – ٢٠٠٦ م، ص ١١.

[3] أبو يوسف: يعقوب بن إبراهيم ( ت ١٨٢ هـ ) الخراج،ط٣،الناشر: المطبعة السلفية ومكتبتها القاهرة عام ١٣٨٢هـ(عن نسخة المكتبة التيمورية برقم:٦٧٤فقه مع معارضتها على طبعة بولاق سنة ١٣٠٢هـ)

لەکاتەکانی نوێژدا نەبێت و، دەتوانن خاچەکانیان لەرۆژانی جەژنیاندا دەربهێنن".

**ت. ڕێزگرتن لەپشووەکانیان و ڕۆژە پیرۆزەکانیان:**

شەرعزانانی موسڵمان هەموو ئەوانەیان بۆ دەستەبەر کردوون و، بۆ نمونە حەرام کراوە: جولەکە لەرۆژی شەمەدا کاری پێ بکرێت، چونکە رۆژی پشوویەتی، لەبەر ئەم فەرموودەیە[1]: «وَأَنْتُمْ يَا يَهُودُ عَلَيْكُمْ خَاصَّةً أَلَا تَعْدُوا فِي السَّبْتِ»، واتە: ئێوەی جولەکە بۆتان هەیە کەلەرۆژی شەمەدا کار نەکەن.

د. گەڕاندنەوەی ماف و مامەڵەو میراتی و حوکمەکانیان بۆ لای ئاینەکەیان:

ئەبو حەنیفە (رەحمەتی خوای لێ بێت) باس دەکات[2]: "ئەهلی زیمە پابەند ناکرێن بەحوکمەکانمان لەقەرزەکان ئەوەی ئەوان بۆچوونیان پێچەوانەیەتی لەمامەڵەدا، لەبەر ئەوە ڕێگریان لێ ناکەین لەمەشروب خواردنەوەو خواردنی بەرازو فرۆشتنی".

---

ص ١٤٦،**هەروەها بڕوانە**: الحيدر آبادي الهندي، محمد حميد الله (ت ١٤٢٤هـ) مجموعة الوثائق السياسية للعهد النبوي والخلافة الراشدة، ط٦،الناشر: دار النفائس – بيروت، ١٤٠٧هـ، ص ٣٨٧ ( ٢٩٨).

[1] ابن البيع النيسابوري: الحاكم محمد بن عبد الله بن محمد بن حمدويه بن نُعيم (ت ٤٠٥هـ)المستدرك على الصحيحين، تحقيق: مصطفى عبد القادر عطا،ط١،الناشر: دار الكتب العلمية – بيروت، ١٤١١ هـ– ١٩٩٠م، ١ / ٥٢ ( ٢٠ ) والحديث صحيح رواه أيضا بعض أهل السنن، وغيرهم.

[2] الزيلعي: عثمان بن علي بن محجن البارعي (ت ٧٤٣ هـ) تبيين الحقائق شرح كنز الدقائق وحاشية الشِّلْبِيِّ، الحاشية: شهاب الدين أحمد بن محمد بن أحمد بن يونس بن إسماعيل بن يونس الشِّلْبِيُّ (المتوفى: ١٠٢١ هـ) ط١،الناشر: المطبعة الكبرى الأميرية – بولاق، القاهرة، ١٣١٣ هـ، ٢ / ١٥٩.

ئیبن عەبدلبر لەزوهریەوە ئەم قسەیەی هێناوە[1]: "سوننەت وابووە کە ئەهلی زیمە ماف و مامەڵەو میراتییان بگەڕێنرێتەوە بۆ لای ئاینەکەیان، مەگەر خۆیان بیانەویت بەپێی حوکمەکانی خۆمان بێت، ئەو کاتە بەپێی حوکمەکانی خوای گەورە بڕیاریان بۆ دەدەین".

هەروەها لەئیبن قاسم گێڕدراوەتەوە[2]: "ناوبژیوانیتی نیوان ئەهلی زیمە لای دادوەری موسڵمان با هەموو لایەنە ناکۆکەکانیش پێی ڕازی بن، ئەوا حوکم لەنێوانیاندا نادرێت بەڕەزامەندی قەشەکەیان نەبێت، ئەگەر قەشەکەیان ئەوەی پێ خۆش نەبوو ئەوا داوەری نێوانیان ئەنجام نادرێت، هەروەها ئەگەر قەشەکەیان ڕازی بوو بەڵام دوولا ناکۆکە کە ڕازی نەبوو یان لایەکیان ڕازی نەبوو ئەوا داوەری لەنیوانیاندا ناکرێت".

**هـ خواردنەوەو فرۆشتنی مەشروب و زینا، ئەگەر هەموو خەڵکی شارەکە لەو پێکهاتەیە بوون:**

مالیک وتوویەتی[3]: ئەگەر ئەهلی زیمەیەک زینای کرد یاخود مەشروبی خواردەوە ئەوا پێشەوا ڕێگریان لێ ناکات، مەگەر ئەو کارە لە شاری موسڵماناندا ئەنجام بدەن و زیانیان پێ بگەیەنن و، فەرمانڕەوا ڕێگریان لەزیانگەیاندن بەموسڵمانان لێدەکات".

زانای پایەبەرز ئەبو زوهرە پاش ئەوەی باسی فەزیڵەو دادپەروەری دەکات دەڵێت[4]: "دادپەروەری، هەروەها یەکسانی و،

---

[1] ابن عبد البر: أبو عمر يوسف بن عبد الله بن عبد البر ( ت ٤٦٣ هـ ) الاستذكار، تحقيق: سالم محمد عطا، محمد علي معوض،ط١،الناشر: دار الكتب العلمية – بيروت، ١٤٢١هـ – ٢٠٠٠م، ٧ / ٤٦٠.

[2] ابن عبد البر: المصدر نفسه ٧ / ٤٦٢.

[3] ابن عبد البر: المصدر نفسه ٧ / ٤٦٢.

[4] المجتمع الإنساني في ظل الإسلام ، ص ٧٠.

ڕێــزی مرۆڤایــەتی و ئــازادی ڕێکخــراو بەحوکمــەکانی عــەقڵ و، بەرژەوەندی کۆمەڵایەتی، ڕێگر لەخراپەو ئاژاوەگێڕی هزری، هەموو ئەوانە، ڕێساو هەمەکین، پێویستە لەهەموو سەرزەوییەک کەمرۆڤی تێدا نیشتەجێ ببێت جێبەجێ بکرێت".

**شاهێدیدانی هەندێک لە گەورە مێژوونووسان و رۆژهەڵاتناسانی رۆژئاوا لەسەر دادپەروەری و لێبوردەیی ئیسلام و موسڵمانان لەگەڵ کەسانی تر لە پەیڕەوکارانی ئاینەکانی ترو تائیفەکان:**

باشترین بەڵگەو لەسەر ئەوەی باسمان کرد شاهێدی دوژمنە بەر لەدۆست، لەم ڕووەوە شاهێدییەک لەخەڵکی خودی رۆژئاوا کە لە گەورەکانیانەوەیە لە مێژوونووسان و رۆژهەڵاتناسان و زانایانی کۆمەڵناسی و ئاینەکان و فەیلەسوفەکان و، جگە لەوان لەو وتە نەمرانەی کە سەبارەت بەئیسلام و موسڵمانان لەدادپەروەری و یەکسانی و لێبوردەییان لەدەوڵەتی هاونیشتمانیبووندا وتراوە:

ـ فەیلەسوفی بەناوبانگ جۆرج برنادشۆیە[1]: "ئیسلام ئەو ئاینەیە کەباشێتیەکانی هەموو ئاینەکانی تیدا دەبینین و، باشێتیەکانی ئەو لەئاینەکانی تردا نابینین!.

لەڕاستیدا ئیسلام هەمیشە جێگای ڕێزو پێزانێنی زۆر بووە، چونکە تاکە ئاین بووە کەقۆناغە جیاوازەکانی ژیانی هەرس کردووەو، ئەو توانایەی هەبوو بەدرێژایی سەردەمەکان دڵەکان کەمەندکێش بکات".

ـ مێژوونووسی بەناوبانگ ویل دیورانت دەڵێت[2]: "لەڕاستیدا ئەهلی زیمە، مەسیحی و، زەردەشتی و جولەکەو صابئی لەسەردەمی

---

[1] شلبي: د. أحمد شلبي: الإسلام، ص ٢٩٤.

[2] ديورانت: قصة الحضارة ١٣ / ١٣٠.

خەلافەتی ئەمەویدا پلەیەکی لێبوردەییان بەرانبەریان بووە، کەنمونەی لـــەولاَتانی مەســـیحی ئـــەمڕۆدا نـــابینین، بەڕاســـتی ئـــازاد بـــوون لەئەنجامدانی دروشمە ئاینیەکانیان و، کڵێساو پەرستگاکانیان پارێزراو بوو".

هـەروەها وتوویـەتی[1]: "جولەکـەکان لـە ولاَتـی رۆژهـەلاَتی نزیکـدا پێشوازیان لەو عەرەبانە کرد کە لـەچنگی فـەرمانڕەوا ستەمکارەکانی پێشوویان ڕزگاریان کردن و.. بوونە خاوەنی ئازادی تـەواو لـەژیان و ئەنجامـــدانی دروشـــمە ئاینیەکانیـــدا.. مەســـیحیەکان ئـــازادبوون لەئاهـــەنگگێڕان بەبۆنـــەی جەژنەکانیانـــەوە بەئاشـــکرا، حاجیـــە مەسـیحیەکانیش کۆمـەڵ کۆمـەڵ بـەئارامی و پـارێزراوی دەهـاتن بـۆ سـەردانی ئارامگـە مەسـیحیەکان لەفەڵەسـتین و، وای لێهـاتبوو ئـەو مەسـیحیانەی لەکڵێسـای دەوڵـەتی بێزەنتـی هەڵگەڕابوونـەوە، ئەوانـەی ڕووبـەڕووی چەنـدین جـۆری چەوسـاندنەوە ووبوونـەوە لەسـەر دەسـتی بەتریکـەکانی قوسـتەنتینیەو ئۆرشـەلیم و ئەسـکەندەریەو ئـەنتاکیا، ئەوانـە ئێسـتا ئـازادو پـارێزراون لەسـایەی فـەرمانڕەوایی موسـڵمانانداو.. موسـڵمانەکان لەپاراسـتنی مەسـیحیەکاندا زیـاتر لەوەشـیان ئەنجامـدا، بـەجۆریک کـەوالی ئەنتاکیـە لەسـەدەی نۆیـەمی زاینیـدا پاسـەوانی تایبـەتی دانـابوو تـاڕێگری بکـات لـەوەی تائیفـە مەسیحیە جیاوازەکان لەناو کڵێسادا یەکتر بکوژن، دێری راهیبەکان و کارەکانیـان لەکشـتوکاڵ و، چاکسـازی لـەزەوی وزاری دێـم بـلاَو بوویـەوەو، چێژیـان لـە مێـووژی بەشـەربەت کـراوی ترێـی دێرەکـان وەردەگرت، لە سـەفەرەکانیاندا چێژیـان لەمیوانداریەکـەیان وەردەگرت و، پەیوەنـدی نیـوان ئـەو دوو ئاینـە لـەکاتیک لەکاتەکانـدا گەیشـتبووە

---

[1] دیورانت: المصدر نفسه ١٣ / ١٣١ ـ ١٣٣.

رادەیەک لەهاوسۆزی کەئەو مەسیحیانەی خاچیان لەسەر سنگیان دانابوو بچنە ناو مزگەوت وتێیدا قسە لەگەل هاورێ موسڵمانەکانیان بکەن.

لەنێو فەرمانبەرانی فەرمی وڵاتانی ئیسلامیدا بەسەدان مەسیحی هەبوو، ژمارەیەک لەوانە گەیشتبوونە پلەی باڵا لەدەوڵەتدا بەجۆرێک کەلەهەندێ سەردەمدا بۆتە هۆی سکاڵاکردنی موسڵمانان، سیرجیۆسی باوکی قەشە یوحەننای دیمەشقی لەسەردەمی عەبدولمەلیکی کوری مەرواندا گەنجینەکاری بەیتومال بووە، یوحەننا خۆی کۆتا باوکانی کڵێسای یۆنانی بووە، سەرۆکی ئەو ئەنجومەنە بووە کە فەرمانرەوایەتی دیمەشقیان کردووەو، مەسیحیەکان لەوڵاتانی رۆژهەڵاتدا لە موسڵمانەکان زیانیان کەمتر بینیوە لە فەرمانرەوایەتی بێزەنتی و کڵێساکانیان".

ـ مێژوونووسی ئینگلیزی تۆماس ئارنۆڵد دەڵێت[1]: "هیچ هەولێکی نەخشە بۆکێشراومان لەلایەن موسڵمانانەوە بۆ ناچارکردنی ناموسڵمانەکان لەسەر قبوڵکردنی ئیسلام یاخود لەرێی چەوساندنەوەی ریکخراوەوە کەمەبەست لێی ریشەکێشکردنی ئاینی مەسیحی بێت نەبیستووە".

هەروەها وتوویەتی[2]: "موسڵمانە سەرکەوتووە عەرەبەکان بەلێبوردەییەکی مەزنەوە لەسەدەی یەکەمی کۆچییەوە مامەڵەیان

---

[1] أرنولد: السير توماس أرنولد، الدعوة إلى الإسلام، تعريب: الدكتور حسن إبراهيم حسن والدكتور إسماعيل النحراوي والدكتور عبد المجيد عابدين، ط١، مكتبة النهضة المصرية، ١٩٧٤م، ص٥١.

[2] **هەمان سەرچاوەو لاپەرە.**

لەگەڵ مەسیحیەکاندا کردو، ئەم لێبوردەییە لەسەدەکانی دواتریشدا بەردەوام بوو، دەتوانین بەڕاستی حوکم بدەین کە ئەو هۆزە مەسیحیانە بوونە موسڵمان بەویستی ئازادانە و هەڵبژاردەی خۆیان بووەو، عەرەبە مەسیحیەکان کەلەم کاتەدا لەنێو کۆمەڵی موسڵمانان دەژین باشترین شاهێدن لەسەر ئەم لیبوردەییە".

روبرتسن لەکتیبەکەیدا "مێژووی شارلکن" دەڵێت[1]: "تەنها موسڵمانان توانیویانە غیرەت لەسەر ئاینەکەیان و، لیبوردەیی بەرانبەر شوینکەوتووانی ئاینەکانی تر پێکەوە کۆبکەنەوەو، ئەوان لەپاڵ دڵسۆزی تەواویان بۆ بڵاوکردنەوەی ئاینەکەیان، وازیان لەو کەسانە هیناوە کەبەئازادی خۆیان نەیانویستووە پابەندی ڕێنماییە ئاینیەکانی ئەمان بین".

---

[1] لوبون: غوستاف حضارة العرب، ترجمة: عادل زعيتر، مطبعة عيسى البابي الحلبي ص ١٢٨.

## دەروازەی سێیەم:

### هاونیشتمانیبوون و فیقهی هاوچەرخ و
### دەستووری مەدینە وەك بناغەی بونیاتنانی دەوڵەتی فرەیی.
### بژاردەی کۆبوونەوەو سازان یاخود کوشتارو پەرتەوازەیی:

پاش ئەو خستنەڕووە خێراییەی حوکمە بەرزەکانی شەریعەتی ئیسلامی سەبارەت بەحوکمی هاونیشتمانیبوون، خستنەڕوویەکی بەسە بۆ کەسێک شتێک لەبەرچاو ڕوونی ئەو قەناعەتەی هەبێت کە رۆڵەکانی یەک نیشتمان لەئەمڕۆدا دوو بژاردەیان لەبەردەمدایە کەسێیەمی بۆ نیە:

١. بژاردەی کۆبوونەوەی و سازان.
٢. بژاردەی کوشتارو پەرتەوازەیی.

خوای گەورە بوونەوەری دروستکردووە ئەوەی تێیدایە هەمووی خستۆتە خزمەتی مرۆڤەوە، بۆ ئەوە مرۆڤی دروست کردووە تا لەگەڵ تاکەکانی ڕەگەزەکەیدا لەئادەمیزادەکان بژی وهاوبەشیان بکات لەئاوەدانکردنەوەی زەویداو، هەوڵدان بۆ چاککردنی و، هاریکاری و هاوشانی لەپێناوی بونیاتنانی کۆمەلگایەکی ئاسایشی پڕ بەختەوەری و خۆشگوزەرانی وئاسوودەیی و، خۆشەویستی و، پێکەوە ژیان، چونکە مرۆڤ بەسروشتی خۆی کۆمەڵایەتییەو، ناتوانێت وەک ئاژەڵ

و دڕەنـدە کێویـەکان بـژی! زانـای پایەبـەرز ئیـبن خەلـدون لـەژێر ناونیشانی کۆبوونەوەی مرۆیی پێویستە، دەڵێت[1]:

"دانایان بەم دەربڕینەیان کە مرۆڤ بەسروشتی خۆی مەدەنییە گوزارشتیان لەوە کردووە کە هەردەبێت بەیەکەوە کۆ بێت کەئەویش بریتییە لەشار".

ئەگەر ئەمە پێویستیەک بێت لەپێویستیەکانی ژیان، ئەوا خەڵکی یەک وڵات لەپێشترن بۆ ئەو پێکەوەبوون و هاوشانی و هاریکارییە کە لـەچوارچێوەی بنچینـەو بنەماکانـدا کـۆبن و، لـەنێوان خۆیانـدا لەسەری ڕێکبکەون.

بەو پێیەی کەلەئەمڕۆدا زۆر ئەستەمە بتوانرێت خەلافەت لەسەر زەوی دابمەزرێنرێت، تەنانەت ئەگەر داشبمەزرێنرێت، ئەوا کاروبارو حوکمـەکان بـەپێی کـات و شـوێنەکان و ڕەوشـەکان و نـەریت و باوەکـان[2] گـۆڕانی بەسـەردا دێـت، پێویسـت دەکـات سیسـتمێکی جێگرەوەی نوێ دابمەزرێت کە مافەکانی ناموسڵمانان و جگە لەوانیش دابین بکات، ئەگەرنا بەجگە لەوە زۆر ئەستەمە[3]!

---

[1] ابن خلدون: عبد الرحمن بن محمد بن محمد، ابن خلدون (ت ٨٠٨هـ)ديوان المبتدأ والخبر في تاريخ العرب والبربر ومن عاصرهم من ذوي الشأن الأكبر،المحقق: خليل شحادة،ط٢،الناشر: دار الفكر، بيروت، ١٤٠٨ هـ – ١٩٨٨ م، ١ / ٥٤.

[2] **بڕوانـە:** الجيزاني: محمَّد بنْ حسَيْن بن حَسنْ، معالم أصول الفقه عند أهل السنة والجماعة، ط٥،الناشر: دار ابن الجوزي، ١٤٢٧ هـ، ص ٣٦٠.

[3] ا **بڕوانـە:** الزمخشري: أبو القاسم محمود بن عمرو بن أحمد (ت ٥٣٨هـ) المستقصى في أمثال العرب، ط٢، الناشر: دار الكتب العلمية – بيروت، ١٩٨٧م، ٢ / ٨٢ ( ٣٠٠).

ئـەبو زوهـرە دەڵێـت[1]: "لـەم سـەردەمەدا ناتوانرێـت تـەنها یـەک حکومەتی ئیسلامی بوونی هـەبێت، بـەڵکو پێویسـتە بۆ هـەر هـەرێمێک دەوڵەتی تایبەت بەخۆی هـەبێت و، هـەموویان لەسـەر پـەیامی خـوا و، بڵاوکردنـــەوەی هاریکـــاری لـــەنیوان خـــەڵکی بەیـــەک بگەنـــەوەو، پەیوەندییەکانیان لەسەر بناغەی یەکبوونی مرۆیی گشتی بەیەکیانـەوە ببەستێتەوەو.. هەموو هەرێمێک سەرۆکیکی هەڵبژێردراوی هـەبێت کـە ئازادانە لەلایەن گەلەکەیەوە هەڵبژێردرابێت".

## دەستووری مەدینەو دەوڵەتی هاوبەشێتی و هاونیشتمانیبوون:

ئـەم دەسـتوورەی کەبەدەسـتووری مەدینـە ناسـراوەو، لەلایـەن پێغەمبـەری ئیسـلامەوە (ρ) دانـراوە لەوانەیـە یەکـەم دەسـتوور بێـت لەمێژوویی مرۆڤایەتیدا دانرابێت کە مافەکانی تاکەکانی یەک کۆمەڵگاو نیشتمان لەهاوشانی و هاریکاری و ئازادی و یەکسانی و، بەشداری پێکردنـــی راســـتەقینەی واقیعـــی دەســـتەبەر بکـــات و، گرنگتـــرین کاروبارەکانی دەوڵـەتی رێکخست، لەپەیوەندییە یاسایی و دادگایی و کۆمەڵایـەتی و ئـابووری و سیاسـی و ئاسایشـی و جگـە لەوانـەش پاراستنی تاک و، ئاسایشی کۆمەڵگاو، مافی یەکسانی لەنێوان پێکهاتەو تاکەکانی نیشتمان، هـەموو ئەوانە لەدەستووری مەدینـەدا دەسـتەبەر کرابوون.

پێشـەوا ئـەبو زوهـرە لەبارەیـەوە دەڵێت[2]: "تیبینـی دەکرێت کەئـەو پەیماننامەیـە بـووە هـۆی هێنانـە ئـارای حـەقی تـەواو، کەلـەم

---

[1] المجتمع الإنساني في ظل الإسلام، ص ٢٥٣.

[2] هەمان سەرچاوە، ص ٥٦.

سەردەمەماندا هاوشێوەی پێکەوە ژیانی ئاشتیانە دەکات، بەڵام ئەو فراوانتر بوو".

پەیماننامە یاخود دەستوورەکە بۆ هەموو ئاین و ڕەچەڵەکەکان مافەکانی هاوولاتی بوون دەستەبەر دەکات، چونکە مافی هاونیشتمانیبوون پیویستی بەیەک عەقیدەیی و یەک ڕەچەڵەکی نیە، لەشاری مەدینەدا عەرەب و جگە لەعەرەب، موسڵمان و بێباوەرو، جولەکەو، گاورو، هاوبەش بڕیاردەر، دووروویی تێدا بوو[1].

تێکڕایی ڕێسا بەرزەکانی شەریعەت لەسەر بناغەی بەرژەوەندی بالآی ئادەمیزاد بونیات نراوە ئیتر هەرچی بن و، لەهەرکوێ بن، بەبێ جیاوازی لەنیوان کەسێک و کەسێکی تردا "ئەو کۆمەلگایەی ئیسلام ڕێکی دەکات بەپێی ڕێسا گشتیەکان بەرێوە دەچێت، ئەم ڕێسا گشتیانەش بۆ خێزان و، کۆمەڵەکان و، دەوڵەت و، پەیوەندییە مرۆییەکانی نیوان خەڵکییە هەرچەند ڕەنگ و جەستەو ئاینیان جیاواز بێت، ئەم ڕێسایانەش لەپارێزگاری لەڕێزی مرۆڤایەتی و، بەرژوەندی و، رووبەڕووبوونەوەی خراپەکاری لەسەر زەویدا پوخت دەبێتەوە"[2]. لەپێناوی ئەمەشدا پێویستە لەسەرمان کەمرۆڤ بکەینە چەق و خاڵی جێی گرنگیپێدانی یەکەممان و لوتکەی پڕبایەخی هەر پرۆژەیەکی دونیایی یاخود ئاینی، چونکە خوای گەورە ریزی لەئادەمیزادەکان گرتووەو، لەسەر وشکایی و دەریاکان هەڵیگرتووەو فەزڵی داوە بەسەر هەموو دروستکراوەکانیدا[3]، هەموو ئەوەی لەئاسمانەکان و

---

[1] **بڕوانە:** الشعبي: أحمد قائد، وثيقة المدينة ؛ الدلالة والمضمون، ط١، وزارة الأوقاف . الدوحة، ١٤٢٦ هـ / ٢٠٠٥م، ص ٦٨.

[2] أبو زهرة: تنظيم الإسلام للمجتمع، نشر دار الفكر العربي. القاهرة، ص٢٥.

[3] **بڕوانە:** سورة الإسراء ؛ آية ٧٠.

زەویدا هەیە لەتوانای ماددی و مەعنەوی[1] بۆی دەستەمۆ کرووە، بۆیە دەبێت بخرێتە پێش هەموو لەبەرچاوگیراو و ناولێنراوە نیشتمانی و نەتەوەیی و حزبی و سەرکردایەتیەکان، بگرە دەبێت نیشتمان وحزب و سەرکردایەتی لەخزمەتی مرۆڤدا بێت و، رێزگرتن و مافەکانی بخرێتە پێش هەر شتێکی ترەوە.

پێویستە لەسەرمان کەپەیوەندییە مرۆیی و برایی و نیشتمانیەکانمان بخەینە سەرو پەیوەندییە ڕێکخستنی و حزبی و نەتەوەییەکانمان و، بەرژەوەندییە کەسیی و خۆیی و هەموو پەیوەندییەکەوە کەلێکمان دوورخاتەوە و رۆڵەکانی یەک نیشتمان و، نێوانی مرۆڤەکان بەشێوەیەکی گشتی بەیەکەوە کۆنەکاتەوە، ئەوە کارێکە لەگەڵ مەبەستە لێبوردەییەکانی شەریعەتدا یەکناگرێتەوە، بونیاتنانی نیشتمانێک و ئومەتێکی یەکگرتوو، براو، هاریکار، هاوشان، یەکسان لەماف و ئەرکەکاندا.

ئەم بیرکردنەوەو تێڕوانینە نوێیە لەخۆیدا جۆرێکە لەفیقهی مەقاصیدو، فیقهی نزیککردنەوەو سەرخستن و نویکردنەوەو گۆڕان و، پێکهێنانی بەردەوام و، وەلانانی چەقبەستن و داخران و دەمارگیریی بەهەموو شێوەو چەشن و پاڵنەرو مەبەستەکانیەوە، دەقەکانی دەستووری مەدینە جەختیان لەسەر ئەمە کردۆتەوە.

لەڕاستیدا ئەم دەستوورە مەزنەی کەپێغەمبەری سۆزو بەزەیی محەمەد (ρ)و پەیامبەری مرۆڤایەتی لەساڵی یەکەمی کۆچی بەرانبەر بە (٦٢٣ز) داینا، بەکۆنترین دەستوری تۆمارکراو لەجیهاندا دادەنرێت، کە پێشکەوتوو شارستانییەو کەهیچ کەس بەرلە موسڵمانان ئەوەی نەکردووە! لە (٥٢) مادە پێکهاتووە، بیست پێنج ماددەیان پەیوەندی

---

[1] **بڕوانە:** سورة إبراهيم ؛ آية ٣٢ . ٣٤،سورة الجاثية ؛ آية ١٣ .

نیوان موسڵمانەکان ڕێکدەخات، بیست وحەوت ماددەشیان پەیوەندی بەناموسـڵمانەکانەوە هەیـە، لەپـەیڕەوانی پـەڕاوە ئاسـمانیەکان و، هاوبەش بڕیاردەران و جگەلەوان و، پەیوەندییەکانی هاونیشتمانیبوون لەنێوان ئەوان و موسڵمان ڕێکدەخات[1].

ئەم دەستوورە بۆ ئەوە دانراوە کەپەیوەندی نیوان موسڵمانەکان خۆیان و، پەیوەندییەکانی نێوان ئەوان و ناموسڵمانەکان دیاری بکات و، ژیانی کۆمەڵگای نویَ ڕێکبخات و، ماف وئەرکەکان و ئازادی و پابەندییەکان بەرانبەر یەکدی ڕوون بکاتەوە، وەک سەرچاوەیەکی دەستووری و یاسایی، لەحاڵەتەکانی ناکۆکی کیشەکاندا بۆ ئەو بگەڕێنەوەو، لەو مافانەی پێکهاتەکانیش کەتییدا هاتووە[2]:

ـ جولەکەکانی بەنی عەوف لەگەڵ باوەڕدارانـدا یەک ئومەتن و جولەکەکان ئاینی خۆیان بۆ هەیە موسڵمانەکانیش ئاینی خۆیان و

---

[1] الهندي:محمد حميد الله الحيدر آبادي (ت ١٤٢٤هـ)مجموعة الوثائق السياسية للعهد النبوي والخلافة الراشدة،ط٦،الناشر: دار النفائس . بيروت السادسة، ١٤٠٧هـ، ص ٥٨ ـ ٦٣، ابن زنجويه: حميد بن مخلد بن قتيبة بن عبد الله الخرساني (ت ٢٥١هـ) الأموال لابن زنجويه، تحقيق الدكتور: شاكر ذيب فياض الأستاذ المساعد – بجامعة الملك سعود،ط١،الناشر: مركز الملك فيصل للبحوث والدراسات الإسلامية، السعودية، ١٤٠٦ هـ – ١٩٨٦ م،١ / ٣٣١، ٢ / ٤٦٧،أبو بكر البيهقي: أحمد بن الحسين بن علي بن موسى (ت ٤٥٨هـ)السنن الكبرى، المحقق: محمد عبد القادر عطا،ط٣،الناشر: دار الكتب العلمية، بيروت – لبنات، ١٤٢٤ هـ – ٢٠٠٣ م، ٨ / ١٨٥(١٦٣٦٩) ابن حديدة: محمد (أو عبد الله) بن علي بن أحمد بن عبد الرحمن بن حسن الأنصاري (ت ٧٨٣هـ)المصباح المضي في كتاب النبي الأمي ورسله إلى ملوك الأرض من عربي وعجمي،المحقق: محمد عظيم الدين، الناشر: عالم الكتب – بيروت، ٢ / ٥ وما بعدها، وقدّم كتاب: الهندي، على بقيّة المصادر التي هي أقدم منها، لاشتماله وجمعه لجميع طرق ومصادر الوثيقة أو الدستور.

[2] ابن هشام: عبد الملك بن هشام بن أيوب الحميري (ت ٢١٣هـ)السيرة النبوية لابن هشام،المحقق: طه عبد الرؤوف سعد،الناشر: شركة الطباعة الفنية المتحدة ٢ / ١٠٧ , وينظر: المصادر السابقة أيضا.

پشتیوانیان دەبن مەگەر کەسێ ستەم و گوناه بکات کەتەنها خۆی دەگرێتەوە.

ـ جولەکەکان بژێوی خۆیانیان لەسەرەو موسڵمانەکانیش بژێوی خۆیان، لەسەریان پێویستە یەکتر سەربخەن هەرکەس دژایەتی ئەم پەیماننامەیەی کرد و، ڕاوێژو ئامۆژگاری و، چاکە و دوورکەوتنەوە لەخراپەیان لەنیواندایە، هیچ کەس خراپەکاری بەرانبەر هاوپەیمانەکەی نەکات و ستەملێکراو سەربخرێت[1].

ـ دراوسێ وەک گیان وایە بێ زیان و بێ گوناهە[2].

ـ ئەم نووسراوە ستەمکارو گوناهبار ناگرێتەوە، ئەوەی رۆشت ئەوا پارێزراو دەبێت، ئەوەشی لە مەدینە مایەوە پارێزراو دەبێت، خوای گەورە پەنای کەسی چاکەکار و بەتەقوایە و محەمەدیش پێغەمبەری خودایە.[(3)]

---

[1] ابن هشام: هەمان سەرچاوە ٢ / ١٠٧-١٠٨.

[2] هەمان سەرچاوەو بەرگ و لاپەڕە.

[3] هەمان سەرچاوەو بەرگ و لاپەڕە.

**بنەمای هاونیشتمانیبوون لای هاوچەرخەکان**

**لەنێوان قبوڵکردن وڕەتکردنەوەدا:**

لەدوێنیدا –بەر لەوەی خەلافەتی ئیسلامی هەرەس بێنێت- وڵاتانی ئیسلامی نیشتمانی هەموو ئەوانە بوو لەدەوڵەتی ئیسلامیدا بەیەکسانی دەژیان، مافەکانیان بۆ هەبوو، ئەرکەکانیان لەسەرشان بوو، بەدەگمەن لەهەندێ کاتی میژوویی ئیسلامدا پێچەوانەی ئەوە بووە، ئەو کاتەی هەندێ لە فەرمانڕەواکان یاخود جگەلەوان لەبنەماو مەبەستەکانی شەریعەت لایاندا یاخود بەخراپ لێی تێگەیشبتن!.

ئاشکرایە کە وڵاتانی وەک: عێراق و، سوریاو، لوبنان و، وڵاتانی تری رۆژهەڵاتی ناوەڕاست پاش ڕێکەوتننامەی سایکس بیکۆو لەدوای جەنگی جیهانی یەکەم و ڕێککەوتن لەسەر دابەشکردنی ناوچەکە بەگوێرەی بەرژەوەندییان دامەزراون"[1]. لەڕەوشێکدا بەڕێوەچوو کەهیچ بەهایەک لەبەرچاو نەگیراو، هیچ پێوەرێکی بابەتی لەدروستکردنی ئەو وڵاتانەدا ڕەچاو نەکرا".

ئێمەی موسڵمان وەک یەکەیەکی تەواوکاری دەست نەداو بۆ دابەشکردن سەیری مرۆڤایەتی دەکەین، کە بنچینەیان یەکەو، باوکیان ئادەمەو، دایکیان حەوایە، با شوینەکانیشیان دوور بێت و، زمان و، ڕەنگ و، ئاینیان جیاواز بێت، نیشتمان ئەو چوارچێوەیەیە کەکۆمان دەکاتەوە لێکمان جیاناکاتەوە، یەکێک لەزانا موسڵمانەکان وتوویەتی[2]:

---

[1] العسلي: بسام العسلي، سلسلة جهاد شعب الجزائر،ط٢،الناشر: دار النفائس، ١٤٠٤ هـ – ١٩٨٤ م ٦ / ٣٠.٣٥.

[2] عبد المنعم أبو الفتوح: المواطنة في المجتمع المسلم، إسلام أون لاين ١٨ /٤ / ٢٠٠٨.

"مرۆڤ لەژیانیدا پەیوەستە بەچەند بازنەیەکی جۆراوجۆرەوە، یەک تەواو دەکەن و لەیەک کەم دەکەن، ئینتیمای نیشتمانی یەکێکە لەو بازنانە، هیچ دژیەکیەکی نیە لەگەڵ بازنەکانی تری ئینتیماو، گونجان لەنێوان ئینتیماکاندا لەخۆشەویستی خێزان و خانەوادە پاشان کۆمەڵ، پاشان نیشتمان، پاشان کۆمەڵە گەورەکە لەئیسلامدا و، تێیدا نمرەی باڵا نمرەکانی خوار خۆی ناسڕێتەوە، بەڵام دەمارگیری و تائیفیەت تێیدا کە ببێتە هۆی پەرتەوازەیی و دابەشبوون و هاندان بێت بۆ ستەمکردن رەتکراوەیە.. لەبەر ئەوە ئێمە لەئێستادا پێویستمان بەهەموو هەوڵێکە کەیەکڕیزی ناوخۆییمان و سەقامگیری ساسیمان بەهێز بکات، کەئەمەش بەبێ سەقامگیری چەمکی هاونیشتمانیبوون و ئازادی لە دەوڵەتی یاسادا نایەتەدی، ئەم چەمکە لەئەمڕۆدا وەک فەرزی عەینی لێهاتووە".

بابەتی هاونیشتمانیبوون بابەتێکی نوێیە لەوڵاتەکانماندا، هەروەک باسمان کرد، لەپاش هەرەسی خەلافەتی ئیسلامییەوە سەری هەڵداوە، بەمەش لە بابەتەکانی فیقهی هاوچەرخە و لەبابەتەکانی فیقهی کۆن نیە، هەربۆیە دەبینین هاوچەرخەکان سەبارەت بەم بابەتە دوو ڕێبازیان هەبووە:

١- ڕێبازی یەکەم: خۆی لەشێخی ئەزهەری پێشوو (محمود شەڵتوت)[1] و ئەو زانایانەی کە هەمان ڕێچکەی ئەویان گرتووە دەبینێتەوە، کەئەم بیرۆکەیەی ڕەت کردۆتەوە، پشتی بەچەند بەڵگەیەک بەستووە لەمەدا، کەلێرەدا بواری تاوتوێ کردنیان نیە!.

---

[1] شلتوت: محمود شلتوت، الإسلام عقيدة وشريعة،ط٦، دار الشروق. القاهرة ١٩٧٢م، ص ٤٥٣.

٢- ڕێبازی دووەم: خۆی لەوەدا دەبینیتەوە کەزانای پایەبەرز (یوسف قەرزاوی)[1] بۆی چووەو ئێمەش بۆ هەمان شت دەچین وپشتیوانی دەکەین و، بینیمان کەئەم بۆچوونە هەمان بۆچوونی برای گەورەو مامۆستامان دکتۆر محسن عەبدولحەمیدە لەدیداریکیدا لەگەل یەکیک لەرۆژنامەکان[2]، لەبەر چەند هۆکاریک، لەوانە:

- چونکە ئەوە گرنگترین مەبەست لەمەبەستەکانی ئیسلام دەهێنیتەدی، کەئەویش بریتییە لە: هینانەدی بەرژەوەندی، وتراویشە: بەرژەوەندی لەهەرکوێ بێت ئەوە شەرعی خوایە[3].

ئەبو زوهرە دەڵێت[4]: "هەندێک لەتوێژەرانی لێکۆڵەر لەکتێبی فیقه لەرابردوودا ئەوەیان بڕیارداوە کەحوکمە تەکلیفیەکان لەشەریعەتدا پەیوەندییەکی بەتینی لەگەل بەرژەوەندییدا هەیەو، پلەکانی تەکلیفیش تێیاندا بەپێی ئەو بەرژەوەندییە تێیاندایە .. هتد، دەگۆڕێت".

- بەدیهێنانی دادپەروەری کە خوای گەورە فەرمانی پێکردووەو، هەموو پێغەمبەران (ﷺ) لەپێناوی بەدیهێنانیدا هاتوون و،

---

[1] القرضاوي: يوسف، الوطن والمواطنة في ضوء الأصل العقدية والمقاصد الشرعية، دار الشروق، ٢٠١٠م،

[2] ينظر مقابلته ؛ صحيفة آزانسالكوردية، إقليم كوردستان العراق ( ١٤ / ١ / ٢٠١٧ م ).

[3] ابن عاشور: محمد الطاهر بن محمد بن محمد الطاهر (ت ١٣٩٣هـ)مقاصد الشريعة الإسلامية،المحقق: محمد الحبيب ابن الخوجة،الناشر: وزارة الأوقاف والشؤون الإسلامية، قطر، ١٤٢٥ هـ – ٢٠٠٤ م، ٢ / ١٧٢، الشنقيطي: محمد الأمين بن محمد المختار بن عبد القادر (ت ١٣٩٣هـ)المصالح المرسلة،ط١، الناشر: الجامعة الإسلامية، المدينة المنورة، ١٤١٠هـ، ص ٥.

[4] المجتمع الإنساني في ظل الإسلام،ص ٧١.

ئاسـمانەکان و زەوی لەسـەر ئـەو ڕاوەسـتاون و، دادپـەروەری جیاکارییەکی ئیسلام و پوختەکەیەتی.

خوای گەورە دەفەرموویت[1]:﴿ إِنَّ اللَّهَ يَأْمُرُ بِالْعَدْلِ وَالإِحْسَانِ وَإِيتَاء ذِي الْقُرْبَى وَيَنْهَى عَنِ الْفَحْشَاء وَالْمُنكَرِ وَالْبَغْيِ يَعِظُكُمْ لَعَلَّكُمْ تَذَكَّرُونَ﴾

لەئایـەتێکی تـردا دەفـەرموویت[2]:﴿ لَقَدْ أَرْسَلْنَا رُسُلَنَا بِالْبَيِّنَاتِ وَأَنزَلْنَا مَعَهُمُ الْكِتَابَ وَالْمِيزَانَ لِيَقُومَ النَّاسُ بِالْقِسْطِ ﴾.

زانـای پابـەرز محەمـەد ئـەبو زوهـرە دەڵێـت[3]: "ئـەو ڕێنماییانـەی ئیسـلام دایڕشـتووە، تائێسـتاش هـەمان ڕەونـەق پـاکی خـۆی هەیـە، ڕاسـترینی هـەموو ئـەو ڕێنماییانەیـە کـەمرۆڤ پێـی گەیشـتووە، ئیـدی ئەوە لە سیستمی حوکمڕانیدا بێت، یاخود لەسیستمی مامەڵەی دارایی، یان سیستمی خێزان، یان ڕێگرییە کۆمەڵایەتییەکان".

لێرەداو پاش بڕیاردانی هاوڵاتیبوون لـەڕووی شـەرعەوە، لەوانەیە هەندێک کـەس ڕەخنـەمان لـێ بگـرن، بەتایبـەت لـەبواری حـوکمڕانی و سەروەری و بەشداری سیاسیی و، مافی هەڵبژاردن و، جگە لەوان لـە بابەتە پەیوەندیدارەکان، ئایا دروستە بۆ هەموو هاووڵاتیان کە تەواوی باشێتیەکانی هاونیشتمانیبوونیان لەوڵاتی ئیسلامیدا بۆ هەبێت؟.

وادیارە بۆچوونی زانایانی هاوچەرخ بـەپێی جیـاوازی تێگەیشـتنیان لـەفیقهی واقیـع و ئـەو دانـایی و تێگەیشـتنەی کـەخوا پێـی بەخشـیووە

---

[1]سورة النحل ؛ آية ٩٠.

[2]سورة الحديد ؛ آية ٢٥.

[3]محمد أبو زهرة، المصدر السابق ص٦٣.

جیاوازە، هەروەک پێشتر وتمان، بابەتێکی سەردەمەو پێویستی بە تێگەیشتنێکی ورد هەیەو پشتیوانیش لە خوای گەورەوەیە، بۆ گەیشتن بەحوکمی خواو واقیعی هاوچەرخ، هەندێک لەزانایان بۆ ئەوە چوون کە ناموسڵمان لەو بابەتانەدا کەباسمان کردن دروست نیە بەشدارییان پێ بکرێت، وەک مامۆستا مەودودی (رەحمەتی خوای لێ بێت) [1]، دەستەی دووەمیش بۆ ئەوە چوون کەتەواو دروستە لەهەموو بوارەکاندا وەک مافێک لەمافەکانی هاونیشتمانیبوون بەشدارییان پێ بکرێت، لەوانە: تارق عەبدولفەتاح ئەلبشری هزرمەندو قازی میسری ناسراو، لە هەندێک ڕووەوە کەسانی تر پشتگیریان لێ کردووە [2]، لەڕاستیدا هەردوو بۆچوونەکە جۆرێک لەوەلانانی شەریعەتیان تێدایە، گومانی تێدا نیە کەهەموو هاووڵاتیەک مافی خۆ پاڵاوتنی بۆ هەموو پۆست و بوارەکان هەیە، بەڵام لەهەموو نیشتمان و هەموو وڵاتێکدا هەندێک تایبەتمەندی هەیە، ئەگەر زۆرینەی دانیشتوانەکەی شوێنکەوتەی ئاینێکی دیاریکراو بوون، لەپێناوی ئەوەدا، ئەو وڵاتەی کە زۆرینەی دانیشتوانەکەی موسڵمانە، وایدەبینین کە ئەو پۆستەی ڕەنگیکی ئیسلامی هەیە لەمافی هاووڵاتیانی موسڵمانە، وەک سەرۆکی وڵات و، دادوەرانی شەرعی و، سەرکردەکانی سوپاو، پێشەوای

---

[1] ینظر المودودي:أبو الأعلى ( ت ١٣٩٩ هـ ) نظرية الإسلام وهديه في السياسة والقانون والدستور، دار الفكر . دمشق ١٩٦٩ م، ص ٢٩٨.

[2] الأفندي:عبد الوهاب، المواطنة والديمقراطية في البلدان العربية، مركز دراسات الوحدة العربية . بيروت، ص ٦١.

گەورە[١]، چونکە ڕاست نیەو ماقوڵیش نیە کەسێکی ناموسڵمان خۆی بپاڵێوێت بۆ پێشنویژی نویژی هەینی یاخود نویژی دوو جەژنەکەو جگە لەوان لەو کاروبارانەی کەپەیوەندداروتایبەتن بەموسڵمانان! هەروەها هەندێک لەپۆستی تر کەکەمێک پێش ئێستا ناومان بردن و کەمن و، تایبەتمەندی موسڵمانانیان هەیە، ئەمەش لەپێناوی پاراستنی بەرژەوەندییە هاوبەشەکان و، پاکی دەروونەکانە لەنیوان هاوولاتیاندا، بەڵام پۆستەکانی کارگێڕی و جێبەجێکردن و، یاسادانان و، جگە لەوان مافی هەموو هاوولاتیانە بەبێ هەڵاوێرد[٢]، خوای گەورەش ئاگادارترە.

[١]**بڕوانە:** هويدي: فهمي هويدي، مواطنون لا ذميون، ط٣، دار الشروق. القاهرة، ١٩٩٩م، ص ١٩٥، القرضاوي: يوسف، من فقه الدولة في الإسلام، ط٣، دار الشروق. القاهرة، ٢٠٠١م، ص١٩٤، ١٩٥.

[٢]غزلان: د. محمود غزلان، نعم الإسلام هو الحل تساؤلات وردود، دار التوزيع والنشر الإسلامية. القاهرة ٢٠٠٦م، ص ٢٣ . ٢٤، الهضيبي: محمد المأمون، نقاط لقاء ووفاق عام لمشروع الميثاق الوطني . القاهرة، ١٩٩٥م، ص ١١.

## کۆتایی لێکۆڵینەوەکە:

پاش ڕوخانی دەوڵەتی عوسمانی دوای ڕێککەوتنامەی سایکس بیکۆ دروشمەکانی داواکردنی دەوڵەتی هاونیشتمانیبوون هاتە نێو وڵاتانی رۆژهەڵاتی ناوەڕاست و وڵاتانی ئیسلامی و، بەرلەوە ئەو کارە لەو وڵاتانەدا لەئارادا نەبوو.

ئەم داواکاریانە مشتومڕێکی زۆری لەنێوان هەموو ناوەندە ئاینی و عەلمانی و جگە لەوانیشدا دروست کرد، ئەم مشتومڕە لەسەر ناوەرۆکی دەوڵەتی هاونیشتمانیبوون و، خەسڵەت وبنچینەکانی و، جێبەجێکردنی لەسەر ئەرزی واقیع بوو، ئایا دروستە ڕەوتی نیشتمانی یاخود دەوڵەتی هاونیشتمانی دروست بکرێت، لەبری حزب یاخود دەوڵەتی شەرعی ئیسلامی و، ئەو بۆچوونە فیقهیانەو بەڵگەکانی چین ئەگەر وەڵامەکە بەبەڵێ بوو؟

ئایا دەکرێت مرۆڤ خۆشەویستی نیشتمان یاخود باوەڕ بە دەوڵەتی هاونیشتمانیبوون، لەگەڵ پابەند بوون بەئاینەکەی پێکەوە کۆبکاتەوە؟

ئەم لێکۆڵینەوە سادەیە هەوڵدانە بۆ وەڵامدانەوەی ئەو پرسیارانە لە ڕوانگەی شەرع وفیقهی هاوچەرخەوە.

ئەوەی بەڵگەمان بۆ هیناوەتەوە لەلێکۆڵینەوەکەدا:

١ـ خۆشەویستی نیشتمان کارێکی فیترییەو، ئیسلامیش بریتییە لە ئاینی فیترەت و واقیعیەو، بۆ سەلماندنی ئەمەش ئایەت وفەرموودەو شوێنەواری باشمان هیناوەتەوە.

٢ـ ئیسلام لەکاتی دانانی یەکەم بەردی بناغەی دەوڵەتەوە، گرنگی داوە بەدەوڵەتی هاووڵاتی وفرەیی و هاوبەشێتی کردارییی، ئەمەش لەڕێی جێبەجێکردنی کردارییی و واقیعی دەستووری مەدینەوە بۆمان

دەردەکــەوێت، کەبەیەکــەمین دەســتوور لــەژیانی مرۆڤایەتیــدا بــۆ ڕێکخستنی دەوڵـەتی هاونیشتمانی لەباشـترین وبـەرزترین شـێوەدا لـە مێژوویی مرۆڤایەتیدا دادەنرێت.

٣ـ ئیسلام لەتێکڕایی یاساو حوکمەکانیدا لەسـەردەمی هـاتنی پەیامـەوە تــا ئــەمڕۆمان هــەموو چەشــنەکانی ئــازادی بــۆ پێکهاتــە جیــاوازو جۆراوجۆرەکـانی لــەئاین و تائیفــەکان دەســتەبەرکردووە، هــەروەها یەکســانی وبەشــداری کرداریــی لەهــەموو کایــەکانی دەوڵەتــدا بــۆ دەسـتەبەر کـردوون تـەنها ئـەو جێگایانـە نـەبێت کەتایبەتمەنـدی لای موسڵمانان هەیە.

٤ـ تایبەتمەندی هەموو ئاین و تائیفەیـەکی لەبـەرچاو گرتـووەو گرنگـی پێـداوەو، هــەموو ئاریشــەکانیانی داوەتــەوە دەســت مەرجەعــەکانی خۆیــان کەبــەپێی بیروبــاوەڕی خۆیــان چارەســەری بکــەن، بــەبێ دەستووەردان لەکاروباریان.

٥ـ لێبـوردنی ئـاینیی لـەگرنگترین ڕێسـاکانی شـەریعەتی بـەرزە، هـەر ئەمەش تۆوی ئاسایش و سەقامگیرییە لەدەوڵـەتی هاونیشـتمانیبووندا، لەمەشدا نەیاران بەر لەدۆستان شاهێدیان بۆ داوە.

٦ـ یەکەمین ئاینە مرۆڤ بکاتە یەکێک لە گەورەترین تەوەرو مەبەسـتە شـەرعیەکانی، داوای ڕێزگرتنـی بکـات ئیـدی هـەر ئاینێـک یـان ڕەنگێـک یـان ڕەچەڵـەکێکی هـەبێت و، مـرۆڤ دەکاتـە یەکەیـەکی تەواومەنـدو داوای یەکخستنی دەکات.

٧ـ مێژوویی ئیسلامی و، شاهێدیدانی ڕۆژهەڵاتناسان و ڕۆژئاواییەکان لەهـەموو ئـاین و نەتـەوەو ڕێچکـەکان شـاهێدی بـۆ ڕاسـتگۆیی بـوون واقیعیبوونی یاساکانی ئیسـلام و، جێبـەجێکرانی لەسـەر ئـەرزی واقیـع بەرانبەر پێکهاتەکانی تر دەدەن.

٨ـ شـەرعزانانی هاوچـەرخ، دەوڵـەتی هاونیشـتمانیبوونیان بـەوە دانـاوە کەدەوڵەتێکە بناغـەو ڕەگ وڕیشـەی لـەمێژوو فیقهـی ئیسـلامیدا هەیـە،

ئەمـەش لـەفیقهی واقیعەوەیـەو بـۆ واقیعـی هاوچـەرخمان پێویسـتەو، ناتوانرێـت لێـی کـەم بکرێتـەوەو، پێویسـتە مامەڵـەی ئـەرێنی لەگـەڵ بکرێت.

٩ـ بەمـە دەگەینـە ئـەنجامێکی چاوەڕوانکراو کەئێمـە (وەک موسـڵمان) دەتوانین لـەپێیناوی نیشـتمان و هاونیشـتمانیی و،چاکسـازیی و، لادانـی سـتەم لەسـەر سـتەملێکراوان و، بەگژداچوونـەوەی گەنـدەڵی و، دابینکردنـی بژێـوی گـەل و، کـارکردن بـۆ بونیاتنـانی دەوڵـەتی هاونیشـتمانیبوونی راسـتەقینەدا لەگـەڵ کەسـانی تـر لەپـەیڕەوکارانی ئاینـەکان و تائیفـەو ئاڕاسـتە چاکسـازیخوازە نیشـتمانیەکان و جگـە لەوانیش کاربکەین، هەموو ئەمانە دەکەونە ژێر رێسـای (بەرژەوەندی بەنـدەکان و وڵات)و دەسـتووری مەدینـە و، ڕێسـا شـەرعیەکان جەختیان لەسەر کردووەتەوە.

## له بڵاوكراوەكانی گۆڤاری خاڵ

١. ئەدەبی گاڵتەوگەپ. ن: تۆفیق كەریم

٢. پێكەوەژیان: بەرەو بەخۆداچوونەوەو گۆڕانكاریی. ن: نازم عەبدوڵڵا

٣. پێوەرەكانی سەركەوتنی رێكخستن و دوانەییە سەرەكییەكانی. و: تۆفیق كەریم

٤. حريه المعتقد وإشكاليه قتل المرتد. د. بختيار نجم الدين شمس الدين

٥. سوننەی سیاسی لە درووستكردن و ڕاپەڕاندنی دەسەڵاتدا. و. ئیسماعیل تەها

٦. حوكمی سەلام كردن لە ناموسڵمان. و.عومەرئەمین

٧. پوختەی بنەماكانی گوتاری سیاسی ئیسلامی. و. ئاسۆ هەورامانی

٨. باشترینی هزرە موسوڵمانەكانی سەدەی بیستەم. و: نزار لگيف احمد

٩. دولة المواطنة و الشراكة والتعددية.دكتور ابراهيم امين جاف

١٠. ناكۆكییە سیاسیەكانی نێوان هاوەڵان و. ڕێدار ئەحمەد

